


ناوی کتێب: یاداشتنامەی مامۆستایەك

بەرگی یەکەم

نووسەر: وەهبی وەققاس ئۆغلۆو

وەرگێڕ: د. زانا ئەحمەد

لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان ژمارە (١٦٣٧)ی ساڵی ٢٠٠٩ ی پێدراوە





ناوەندی ڕاگەیاندنی ئارا

بنکەی سەرەکی بڵاوکردنەوەی بەرهەمەکانی ناوەندی ڕاگەیاندنی ئارا - سلێمانی / شەقامی پیرەمێرد

0770 358 7100 - 0750 106 9589 www.aramediacenter.com | ara.m@hotmail.com



© سەرجەم مافەکانی ئەم بەرهەمە پارێزراوە بۆ ناوەندی ڕاگەیاندنی ئارا

بەپێی ڕێککەوتنی فەرمی نێوان ناوەندی ڕاگەیاندنی ئاراو دەزگای بەرهەمهێن و نووسەرەوە، ناوەندەکە ڕێگە نادات بە لەچاپدانەوە و کۆپی کردن یاخود دابەزاندنی لە سایت و تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان یاخود خستنە سەرشێوازی دەنگ بۆ میدیاکان بەهەر شێوازێك بێت. سەرپێچیکاریش تووشی سزای یاسایی دەبێتەوە.

## پێشەکی

تۆ بڵێی چی لە یادداشتنامەی مامۆستایەکی ئایینیدا هەبێ؟ ڕەنگە ناوەڕۆکی ئەم یادداشتە هەر وەك هی ئەو مامۆستایانەی ئایین بێ کە یادداشتەکانیان تۆمارکردووە و خستوویاننەتە سەر کاغەز. چونکە پرسیارەکان یەکن، هەست و بیروڕا و خۆشی و ناخۆشییەکان هەر یەکن.

وەك لە ناوەکەیدا دیارە، ئەمەی بەر دەستتان کۆمەڵە یادداشتێکی پەرش و بڵاوە، بێ هیچ ڕیزبەندییەك و وەك ئەوەی باسم کردوون، یان ڕاستتر بڵێم لە بیرم ماون، نووسیومنەتەوە. هۆگریم بۆ پیشەکەم و پەرۆشیی دۆستانم بوونە هۆی ئەوەی ئەم یادداشتانە بنووسمەوە.

ئەگەر ئەم نامیلکەیە بووە جێی سەرنج و بە گرنگ زانرا، نووسینەوەی ئەودواکەشی دەکەمە ئەرکی سەرشانم. ئەمانە یادگاریی پیشەکەمن، کە یانزە ساڵ لەمەوبەر دەستم دایێ و تا ئێستاش ناتوانم دەستبەرداری ببم. لە هەر یەکێك لەم یادگارییانەدا ڕووی پاك و گەشی قوتابییەکانم دەدرەوشێتەوە، کە هەرگیز ناتوانم لەبیریان بکەم، ئەو قوتابییانەی کە بە پرسیارەکانیان دڵە باوەڕدار و ڕۆحە کامڵەکانیان دەردەخست، بە سەرنج و قسەکانیان ئەوەندەی تر

هانیان دەدام، بۆیە هەر کاتێك کە لێیان دادەبڕام، هەڵپەی سۆزێکی منداڵانە ناخی دەتەنیم.

هەر بۆیە نەمدەتوانی لێیان جیاببمەوە و لەو دڵانەیان زویر ببم کە بەدوای باوەڕدا وێڵ بوون. هەرگیزا و هەرگیز تۆمەتبارم نەدەکردن. خۆ مەحاڵ بوو بتوانرێ بە چەشنێکی دیکە مامەڵە لەگەڵ ئەو ناخە پڕ لە خۆشەویستییەیاندا بکرێت.

ویستم لەسەر ڕووی لاپەڕەکانیشدا لەگەڵیان بدوێم، لەسەر کاغەزیشەوە هەر گوێیان بۆ ڕابدێرم، تا ئەوان بپرسن و منیش وەڵامیان بدەمەوە. چونکە ئەوان دەیانەوێ گوێ بگرن و تێبگەن، تا باوەڕیان بەهێز ببێ.

ئەگەر ئەم کتێبە توانی ببێتە هەنگاوێکی بچکۆلانە لە خزمەت کردنی بیر و باوەڕیان، ئەوە دیسانەوە دڵم لە خۆشیدا دەدات لە شەقەی باڵ.

ئەم کتێبە لە ناخی دڵەوە پێشکەش دەکەم بە گشت قوتابییەکانم، لە یەکەمیان تا دواهەمیان. پێشکەشە بە (ئەحمەد) و (محەمەد) و (عائیشە) و (فاتمە) و هەموو ئەوانی دی....

**وەهبی وەققاس ئۆغلوو**

**٢٩ی شوباتی ١٩٨٤**

**باخچەلی ئێڤلەر**

# پێشەکی وەرگێڕ

(خانی) وتەنی:

**سەر نامەیێ نامە "ئەللا"　　　　بێ نامێ وی ناتەمامە وەللا**

ستایش بۆ کردگاری بوون و درووودیش لە سەرداری مرۆڤایەتی و شوێن پێ هەڵگرانی.

ئەم زنجیرە کتێبەم لە کاتێکدا خوێندەوە کە لە دوا قۆناغەکانی بنەڕەتیدا بووم. چێژێکی زۆرم لێ وەرگرتن و یاریدەدەرێکی باشم بوون بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی شەپۆلی گومانەکان. تا لاوانی هاوزمانیشم هەمان سوودیان لێ وەربگرن، کەوتمە وەرگێڕانیان.

بێگومان ئەو کارە کاتێکی زۆری دەویست و بەردەوام بوون لەسەری ئاسان نەبوو، بەڵام نزا و هەڵنانی خوێنەران نەیانهێشت دەستی لێ بەربدەم، تا ئەوەی بە یارمەتیی خودا بە پایان گەیشت و ڕەغبەتێکی زۆریشی کەوتە سەر، ئەوەتا ئەوە بۆ چەند جارێکە چاپ دەکرێنەوە.

نووسەر لە میانی ئەم چەند بەرگە کتێبەدا زۆر بەجوانی و بە شێوەیەکی لێوان لێو لە بەڵگەی عەقڵی و نەقڵی، هەروەها دەقی وێژەیی و قسەی نەستەق و ... هتد وەڵامی زۆرێک لەو پرسیارانە دەداتەوە کە بووە بە ماخۆلانی زۆرانێك و بەتایبەتیش گەنجان.

بەنـدەش هـەوڵێکی زۆرم داوە بـە ئەمانەتـەوە ئەرکەکـە بـەجێ بگەیەنم و تا بکرێ شێوازە جوانەکەی نووسەر نەشێوێنم و لـە تـەڕ و پاراوییەکەی کەم نەکەمەوە. تا چەند سەرکەوتوو بووم نازانم!

نووسەر چەند کتێبێکی دیکەی لـەم جۆرەی هـەن، بریا مـژووڵیی ڕۆژگار ڕێگەی دابایـن درێژەمان بە وەرگێڕانی بەرهەمەکانی ئـەو کەڵـە پەروەردەکارە بدایە.

"ئەوەی سوپاسی خەڵکی نەکات، سوپاسی خـوداش ناکـات" لـەو پێودانگـەوە سوپاسـی گشـت ئـەو کەسـانە دەکـەم کـە هانـدەر و دەستبارگرم بوون. بـەر لـە هـەر کەسێك مامۆسـتای بـەڕێزم (ئێـرۆڵ ئـەتڵگان) کـە بـۆ یەکـەم جـار وەرگێڕانـی ئـەم کتێبانـەی خسـتە مێشکمەوە. سوپاسی بـرای بـەڕێزم و شـاعیری هەسـت ناسـك گـۆران عەباسـیش دەکـەم کـە بەشـێکی دەقـە ئەدەبییـەکانی بـۆ دووبـارە هۆنیمەوە، ئینجا یەکە بە یەکەی ئەندامانی خانەوادەکەم کە بەرگـەی ئەو سەرقاڵ بوونەی منیان گرت و لەو ماوەیەدا ئەرکـەکانی منیشـیان ڕادەپەڕاند. ڕێز و حورمەتم بۆ برایانم لە کتێبخانەی مەحوی هەیە، کە چەند چاپێکی پێشوویان لەئەستۆ گرت.

هەوڵ و ماندووبوونی بـرا و خوشکانیشـم لـە ناوەنـدی ڕاگەیانـدنی ئـارا بـەرز دەنرخێنم کـە مانـدوون لەگـەڵ ئـەم کتێبانـەدا و خـەیلێك مەمنوونیانم.

خوازیـارم ئـەم کتێبانـە ببنـە قومـە ئاوێـك و تینـوێتیی ڕۆحـی و مەعریفیی خوێنەران بشکێنێت.

ئەگەر توانیبێتمان خزمـەتی بـاوەڕی تاکـە کەسـێکیش بکـەین، چ خۆشییەکە بۆ ئێمە!

بـا زیـاتر دواتـان نەخـەم لـە خوێندنـەوەی کتێبەکـە، نزاخـوازم پـەروەردگار ئـەم کـارەی بـە باشـتر لـەو نیـازەی هـەمانبووە لـێ وەرگرتبێ و بیشیکا بە مایەی سوود بۆ گشت ئەوانەی دەیخوێننەوە.

بە دوعا...


**د. زانا ئەحمەد**
zanaahmad@yahoo.com
ئیستەنبووڵ، ٨ی ئاداری ٢٠١٤



## مردن نەبوایە

"مردن نەبوایە، ژیان گشت
جوانییەکانی لەدەست دەدا"
**گۆگۆل**

لــە پــۆلی هەشــتەمی بنەڕەتیــدا بــووم، دەرســی بــاوەڕ بــە فریشتەکانیان هەبوو. باسی ئەوەم بۆ دەکردن کە فریشتەکان هیچ خراپــەکاری و گوناهێــك ناکــەن، هەرچــییەك دەیکــەن پەرســتش و بەندایەتییە بۆ خودا.

(ثۆیا) هەڵسایە سەر پێ و وتی:

– بەڵام مامۆستا! ئایا (فریشتەی گیانکێشان) لەمە بەدەر نییە؟

– بۆچی کچەکەم؟!

– لەبەر ئەوەی گیانی مرۆڤ دەکێشێت، ڕۆح لە لاشەی هەموو مرۆڤێك جیا دەکاتەوە و دەیانمرێنێ. ئایا بەمەش دەوترێت کاری چاك؟

– ئەی بۆ نا، کچی خۆم؟! مردنیش بۆ خەڵکی خێری تێدایە.

گشت قوتابییەکان کەوتبوونە نێو پاکیزەییە منداڵانانەکەیانەوە و وا گوێیان ڕادێرابوو، هەناسەیان لەخۆ بڕیبوو.

دووبارە وتم:

– مردن شتێکی باشە، چاکەیەکی خودایە بەرانبەر مرۆڤەکان.

کاتێك دەمویست بەم شێوەیە باسەکە پوخت بکەمەوە، قوتابییەکان و بەتایبەتیش کچەکان ڕووخساریان شێوابوو، ترسی ناخیان لە ڕووخساریان ڕەنگی دەدایەوە، بەڵام باشیش گوێیان ڕادێرابوو.

وتم:

– تاوێك بیر بکەنەوە. ئەگەر پیرەکان نەمردنایە، چی ڕووی دەدا؟

وەڵام بەدوای وەڵامدا دەهات:

– کێ چاوی لەو هەموو خەڵکە دەبوو کە پێویستیان بە چاودێرییە؟ مردن نەبووایە، ژمارەی ئەوانەی کاریان دەکرد و دەستکەوتیان دەبوو لە کەمیی دەدا. ئەوانەشی کە لەسەر حازریی

دەیانخوارد و نەیاندەتوانی هیچ کارێك بکەن و سەرباری ئەوەش پێویستییان بە چاولێبوون دەبوو، زیادی دەکرد. جا چۆن ڕێز و خۆشەویستیمان بۆ ئەوانە بەردەوام دەبوو، کە ئاوا دەبوون بە بار بەسەرمانەوە؟ چۆن دەمانتوانی بەدڵ و بەگیان چاودێرییان بکەین؟ ئایا ئەمە مومکین بوو بەرانبەر بە کەسانێك کە تا هەتایە بەسەرمانەوە دەبوون؟ ئەمە جگە لەوەی ڕۆژ بە ڕۆژ حاڵیان شپرزەتر دەبوو، دەستیان دەکەوتە لەرزین و چاویان لە بینین دەکەوت، نانیان پێ نەدەخورا و ئاویان پێ نەدەخورایەوە، خواردن و خواردنەوەیان بەسەر خۆیاندا دەڕشت. هەر بەوەندەش بوەستایە باش بوو، نەیاندەتوانی بچنە سەر ئاویش. ڕۆژ بە ڕۆژ ئەم ژیانە بۆیان زەحمەتتر دەبوو و وای لێدەهات لە قەرەی نەیەن. ئێستا ئێوە بڵێن: ئایا ژیانێکی وا خۆشترە یان مردن؟

ئینجا، مەگەر مردن بۆ کەسێك کە بە موسوڵمانێتی ژیابێت و بە موسوڵمانێتییش مردبێت، خراپە؟ ئایا بۆ کەسێك کە بە سەربەرزی و دینداریيەوە دەژی و پاشانیش هەر بە باوەڕداری سەر دەنێتەوە، مردن ڕووداوێکی پڕ مەترسییە؟

وای لێهات خۆیان کەوتنە وەڵام دانەوەی پرسیارەکە:

- نەخێر، مامۆستا! بۆ وەها کەسێك، مردن ڕزگار بوونە لە ژیانێکی پڕ لە تەنگ و چەڵەمە و چوونە بەرەو ژیانی بەهەشتی پڕ لە خۆشی و کامەرانی.

بەم جۆرە بۆم ڕوون کردنەوە کە مردن بۆ گەلێك بەساڵاچوو و نەخۆش - کە بەدەست ئێش و ئازارەوە ناڵەیانە- ڕزگار بوونە. چ جای ئەوەی ئەو کەسە بە جۆرێك ژیابێ کە قیامەتی بردبێتەوە، ئەوە بۆی دەبێتە دەروازەی بەختەوەری و ئاسوودەییەکی نەبڕاوە. کەواتە فریشتەی گیانکێشان کارێکی خراپ ناکات، بەڵکو پاسپۆرتی بەهەشت دەداتە مرۆڤی باوەڕدار و ڕایدەگەیەنێت کە ئەرکداری و ڕەنجبەریی دونیا بەکۆتا هاتووە و کاتی پاداشت وەرگرتنەوەی نەبڕاوە هاتووە.

دە ئێستا ئێوە بڵێن:

- ئایا ئەو گەورە فریشتەیەی فریشتەی گیانکێشانی ناوە، چاکە لەگەڵ ئادەمزاددا دەکات یان خراپە؟

***

لەم سەروبەندەدا زەنگ لێی دا و کۆتاییمان بە باسەکە هێنا. ئۆیا بە تروکاندنی ئەو چاوانەی کە لە خۆشیدا دەبریقانەوە، دەیڕوانی و وتی:

– مامۆستا! ئێستا بۆم ڕوون بووەوە مردن بۆ کەسی باوەڕدار شتێکی خراپ و قێزەون نییە. ئەوەی خوا گیان دایهێنابێ بەجێ و بەسوودە.



کارمان بەم قسانە، ناسینی خوایە
ئەو ڕۆحەمان کە لە جەستەماندایە
ڕۆژێکیش دادێ، دەردێ و هەم دەڕوا
چوون مەل لە قەفەس دەڕوا بێ پەروا

یوونس ئەمرە



## شەیتان بۆچی بەدیهێنراوە؟

ڕزگار بوون لە پرسیاریان چەند زەحمەتە! لە وانەی دواتریشدا هەمان باسیان کردەوە:

– مامۆستا گیان! لە وانەی ڕابردوومانـدا باسی ئەوەت کرد کە بەدیهێنرانی فریشتەی گیانکێشان لەلایەن خوداوە، کارێکی جوان و بەجێیە، ئەوەشت بۆ ڕوون کردینەوە؛ ئەوەی ئەو فریشتەیە دەیکات چەند سوودی هەیە. بەڵام خۆ فریشتەی گیانکێشان فریشتەیە، بۆیە دەکرێ باش بێ، بەڵام ئایا دەکرێ بە لەبەرچاو گرتنی ئەو فریشتەیە بڵێین هەر چییەك خودا دروستی کردووە باش و بەکەڵکە؟

– بێگومـان بـەڵێ. هەرچییەك خـودا دروسـتی كردبـێ، بـاش و بەكەڵكە.

وەك بڵێی دەیانویست ئەو ڕستەیەم پێ دووبارە بكەنەوە، چـونكە وا دیـار بـوو لـەناو مـەراقێكی تێكـەڵ بـە خۆشـیدا ئـەم پرسـیارەیان دەكرد:

– ئەگەر وا بێ، بەدیهێنانی شەیتانیش كارێكی باش و جوانە. خـۆ ناكا شەیتانیش سوودی هەبێت؟

پرسیارەكە كرا و نەكرا، غەڵبە غەڵب دەسـتی پێكـرد. هەنـدێكیان تانـەیان لـە پرسـیارەكە دەدا و هەنـدێكی تریشـیان لەبـەر خۆیانـەوە وەڵامیان دەدایەوە.

بەپێی بۆچوونی نزیكەی هەموویان، قابیل نەبوون بە بـەدیهێنرانی شەیتان بوترێ باش، چونكە هەر ناوی بە خۆیەوەیەتی كـە شـەیتانە. ئەی مەگەر ئەوە شەیتان نییە كە هەموو هێزی خۆی خستووەتە گـەڕ بۆ خراپەكاری و زیان گەیاندن و لەخشتە بردنـی ئـادەمزاد؟ تـۆ بڵێـی بوونەوەر (كائن)ـێكی وا هیچ سوودێكی هەبێ؟ كەواتە گەڕان بـەدوای جوانی لە بەدیهێنرانیدا، هەوڵێكی مایەپووچە...

دوای ئەوەی ئەوان قسەی خۆیان كرد، وتم:

– ئازیزەكانم! ئێستا باسی هۆ و حیكمەتی بەدیهێنرانی شەیتان و لـە ڕێـی ئەمانەشـەوە سـوودەكانیتان بـۆ دەكـەم. ئەوسـا بۆتـان

دەردەکەوێ، کە خودا شەیتانی دروست کردووە، کارێکی چاکی کردووە.

لەنێو ڕوانینە حەپەساوییەکانیاندا، کە وەك بڵێی دەیانوت: "چۆن شتی وا دەبێ؟!"، درێژەم بە باسەکە دا:

## ئایا باران زیانبەخشە؟

– ڕۆڵە شیرینەکانم! خودا لەم جیهانەدا شتێکی بێهودە واتە نابەجێ و بێکەڵکی دروست نەکردووە. بەڵام لەبەر ئەوەی جار جار هەندێك لەوان زیانمان پێدەگەیەنن، پێمان وایە خراپ و بێکەڵکن. بۆ نموونە: بیر لە باران بکەنەوە، چەند سوودبەخشە، وا نییە؟ لە ئاوەکەی دەخۆینەوە، ژیان بە بەر ڕووەکەکاندا دەکاتەوە، ئەو نەبێ ژیان وشك و برینگ دەبێ. هەر بۆیە بابوباپیرانمان ناویان ناوە «ڕەحمەت». هەر بەڕاستییش لە ڕێی ڕەحمی خوداوە لە ئاسمانەوە دادەبارێت. هەر کاتێکیش دێر بکەوێ، خەڵکی دەستی نزا و پاڕانەوە بۆ خودا بەرز دەکەنەوە و داوای لێدەکەن بارانیان بۆ ببارێنێ.

ئێستا من لە ئێوە دەپرسم: بۆ یەکێك کە لە زستاندا بە جلوبەرگی هاوینەوە و بێ ئەوەی چەتر هەڵبدات بچێتە بەر باران. باران باشە یان خراپ؟ خراپە، وا نییە؟ نەخۆشی دەخات. خراپییەکەی مشتومڕ

هەڵناگرێ. باشە، ئەگەر بێین و بە ناوی ئەوەی باران بۆ وەها کەسێك خراپە، بڵێین باران زیانی هەیە یا نەبارێ، کارێکی ژیرانەیە؟!

– نەخێر، قسەی وا گەمژانەیەو، ژیرانە نییە...

کەواتە ئەو کەسەی کە بارانی ڕەحمەت بۆ خۆی دەکاتە زەحمەت، هەڵەی کردووە. چونکە مانای وایە ئەو بارانەی کە لە ئەسڵدا سوودبەخشە، بە هۆی هەڵە و کەمتەرخەمیی ئەو کەسەوە بووە بە زیانبەخش.




● ئەگەر لە ڕۆژێکی باراناویدا دەربچینە دەرەوە و بەو هۆیەشەوە نەخۆش بکەوین، دەتوانین باران بە خراپ دابنێین؟

## ئەگەر بە چەقۆ تاوان ئەنجام بدرێت...

– ئەی چەقۆش هەر وا نییە؟ ئایا دەکرێ چەقۆ کە بۆ ئەوە دانراوە لە چێشتخانەدا سەموون و شتی وای پێ ببڕرێ، بە زیانبەخش دابنرێت؟

بەڵام ئەگەر بێت و لە جیاتیی سەموون سەری زەلامی پێببڕێ، دەبێ بە پیاوکوژیی، کە یەکێکە لە گەورەترین تاوانەکان. ئێستا با لەوە ڕابمێنین، ئایا کاتێک یەکێک دەچێ بە چەقۆ سەری خەڵك دەبڕێ، کەس دەچێ ئەو وەستایە بگرێ کە ئەو چەقۆیەی دروست کردووە؟ ئەو وەستایە نەك هەر ناگیرێ و سزا نادرێ، بەڵکو کەس بەدواشیدا ناگەڕێ و لێ پێچینەوەشی لەگەڵدا ناکات. چونکە خۆ ئەو بۆ سەربڕین دروستی نەکردووە.

تاوانبار ئەو کەسە نییە کە چەقۆکەی دروست کردووە، بەڵکو ئەوەیە کە تاوانی پێ ئەنجام داوە و پیاوی پێ کوشتووە.

ئەوەی پیاوی پێ کوشتووە، لە دەرەوەی ئەو ئامانجە بەکاری هێناوە کە بۆی دروست کراوە. بۆیە ئەوەی ئەو چەقۆیەی لە دڵی یەکێك گیرکردووە، بە تاوانبار دادەنرێ، نەك ئەوەی دروستی کردووە. کەواتە خراپ، دروست کردنی چەقۆ نییە، بەڵکو شێوازی بەکارهێنانەکەیەتی.



● چەقۆ بەدەستی چێشتلێنەرەوە بێت، سەموون دەبڕێ و گۆشت قاش قاش دەکات، بەڵام بەدەستی پیاوکوژەوە بێت، خوێن دەڕێژێت و ماڵ وێران دەکات. ئایا تاوان لە چەقۆیە یان لەوەی دەیگرێ بەدەستەوە؟

# ئاگر نەبوایە...

– با نموونەیەکی تریش بێنینەوە: بیر لە ئاگر بکەنەوە. ئایا سوودبەخشە یان زیانبەخش؟

ئاگر بۆ مرۆڤ گەلێك پێویستە، وا نییە؟ ئاگر نەبوایە، شارستانێتی تووشی گەلێك زیان و کەموکوڕیی دەبووەوە، وایە یان نا؟ بەڵام ئەگەر بێت و بە ناوی ئەوەی ئاگر ئاوا بەسوودە و مرۆڤ هێندە پێویستی پێیەتی، دەستت بخەیتە ناوییەوە، ئەوا کارێکی ناڕەوات کردووە و وات کردووە ئاگر بە زیان بەسەرتدا بشکێتەوە. بەم جۆرە ئەو ئاورەی بۆ هەموو کەسێك سوودبەخشە، بۆ تۆ دەبێتە زیانبەخش. بەو واتایەی ئاگرەکە بەهۆی بە هەڵە بەکارهێنرانی لەلایەن تۆوە، چووەتە باری زیان گەیەنەرییەوە. مادام ئاگر ئەوەندە پێویست و بەسوودە، مانای وایە بەدیهێنرانیشی کارێکی بەجێیە...



● کاتێك ئاگر دەکەوێتەوە، مەرگەسات ڕوودەدات. بەڵام ئایا تاوان لە بەدی هێنانی ئاگرە یان لە مرۆڤە سەرەڕۆ و خەمساردەکانە؟

# بەدیهێنانی شەیتان، کارێکی نابەجێ نییە

– ئینجا با بێینەوە سەر مەسەلەی شەیتان... ئایا بەدیهێنانی شەیتان کارێکی بەجێیە یان بێجێ؟ خودا بۆچی شەیتانی بەدیهێناوە؟ ئایا هەر بۆ ئەوەی خەریکی خراپەکاری بێت و خەڵکی تووشی گوناه و تاوان بکات؟

هەندێك لەو قوتابییانەی توانیبوویان لە سایەی نموونەکانی پێشوو بیر بکەنەوە، دەمودەست دەستیان بەرز کردەوە و وەڵامیان دایەوە. لە حیکمەتی بەدیهێنانی شەیتان گەیشتبوون. بە قسەکانی من و هی ئەوانیش گەیشتینە ئەو ئەنجامە هاوبەشەی کە بەدیهێنانی شەیتانیش لە بنچینەدا خراپ و نابەجێ نییە.

ئەوەی پێی گەیشتین ئەوە بوو کە خودا لەبەر هۆیەك و بگرە هۆیەکی زۆر بەسوود و بەجێ، شەیتانی بەدیهێناوە، چونکە خودا بەندەکانی خۆی خۆش دەوێ و دەخوازێت بەندەکانی چاك و سوودبەخش بن و شایستەی چوونە بەهەشت بن. شەیتانیش هۆکارێکە بۆ هێنانەدیی ئەم مەبەستە، وا دەکات مرۆڤەکان خێر و چاکەیان زۆر بێت و شایستەی بەندایەتیی خودا بن. خودا مرۆڤی بە چەشنێك دروست کردووە کە هەم دەتوانێ پایەبەرز بێ و هەمیش

دەتوانێ خۆی نزم بکات. بەو واتایەی: ئەگەر مرۆڤ بیەوێ دەتوانێ خۆی بگەیەنێتە پایەیەکی وا کە شایستەی ئەوە بێت دراوسێیەتیی پێغەمبەران(سەلامی خوایان لێ بێ) بکات. هەر ئەو مرۆڤە، ئەگەر بیەوێ دەتوانێ خۆی وا سووك بکات، بگاتە ئاستی ئاژەڵان و بگرە خوارتریش. ئا لەم بەرز و نزم بوونەوەیەدا، شەیتان بەکەڵکی مرۆڤ دێت. مرۆڤ کە گوێی لێنەگرت و بەرەنگاریی ئەو خراپەکارییانەی کرد کە ئەو دەیەوێ بیخاتە ناخییەوە، لەسەروو ئەوەشەوە پێچەوانەی خواستەکانیی ئەنجام دا، بەرز دەبێتەوە و دەبێ بە فریشتە. هەندێ جار دەتوانێ ئەوانیش تێبپەڕێنێت و بگاتە پایەیەکی مەعنەویی وا بتوانێ ببێتە هاوسێی پێغەمبەران(سەلامی خوایان لێ بێ)، بەڵام ئەگەر هات و گوێی بۆ ڕادێرا و بە قسەی کرد دەگلێ و نزم دەبێتەوە و بەهای خۆی لەدەست دەدا و دەبێتە ئاژەڵ، تەنانەت لەوەش نزمتر دەبێت و دەبێت بە شەیتان. هەر لەبەر زۆر بوونی ئەم جۆرە کەسانەشە کە لە ڕۆژگاری ئەمڕۆماندا شەیتان خەیاڵی تەختە و کەس هێندەی ئەو پشوو نادات. ئەمەش لەبەر ئەوەی کە ژمارەی ئەو کەسانەی بەوپەڕی دڵسۆزییەوە ئەرکەکانی ئەویان خستووەتە ئەستۆی خۆیان و بۆی ئەنجام دەدەن، زیادی کردووە. شەیتانیش پاڵی لێ داوەتەوە و بە شوێن کەیف و سەفاوەیە.

## شەیتان وەك لاستیکی بۆکسێنە

کەواتە وەك چۆن پێویستە بە چەقۆ خواردن سازبکرێت، لەبەر ئەوەی بۆ ئەو مەبەستە دروست کراوە، بە ئاگریش چێشت لێبنرێت، خۆ ئەگەر یەکێك دەست بخاتە ناوییەوە بەدەست ئازارەوە دەتلێتەوە، چونکە هی ئەوە نییە.

بە هەمان شێوە هۆی بەدیهێنرانی شەیتانیش ئەوە نییە گوێی لێبگرین و شوێنی بکەوین، بەڵکو بۆ ئەوەیە هەر جارێك هاتە لامان هەڵیبرین و چیی وت پێچەوانەکەی ئەنجام بدەین. لەم ڕووەوە شەیتان وەك لاستیکی بۆکسێن وایە. بۆ مشتەکۆڵەکارێکی زیت و وریا، لاستیکی بۆکسێن ئامرازێکی باش و بەسوودی مەشقە. کە پێیدا دەکێشێت، ماسوولکەکانی گەورە دەبن و هەناسەی دەبێتەوە و توانای جەستەیی زیاد دەکات. ئیَ خۆ ئەو لاستیکە، ئەرکی هەر ئەمەیە و بۆ ئەوەیە یاریزان مەشقی لەسەر بکات تا توانا جەستەییەکانی بەرەو پێش بچن. لەگەڵ ئەوەشدا هیچ دوور نییە ئەو لاستیکە بۆ یاریزانی دەبەنگ زیانی هەبێت. چونکە ئەگەر بێت و لە کاتی مەشقدا خەریکی قسە وتن بەم و بەو بێت و خەیاڵی لە لایەکی تر بێت و بەم هۆیانەشەوە لە کاتی خۆیدا مستێك نەسرەوێنێتە لاستیکەکە، ئەو پێیدا دەکێشێ و دەموچاوی دەپێکێ. ئەگەر

یاریزانێکی وا بێت و بڵێت: "با لاستیکی بۆکسێن لە هۆڵی مەشق لابرێت، چونکە زۆر زیانبەخشە"، ڕاستی وتووە؟



● یاریزانانی مشتەکۆڵە لەسەر لاستیکی بۆکسێن مەشق دەکەن. هەر مشتەکۆڵەکارێك مەشقی لەسەر نەکات، بەئاسانی لە بەرانبەر ڕکابەکارەکەیدا دەبەزێت.

ڕاستە لاستیکەکە بۆ ئەو خراپ بووە، بەڵام ئەمە تەنها و تەنها بە هۆی خراپ بەکارهێنانی خۆیەوە بووە. بە هۆی ئەوەی ئەو یاریزانە نەیزانیوە چۆنی بەکار بهێنێت، یان زانیویەتی و وەك پێویست بەکاری نەهێناوە، لاستیکەکە بۆی بووە بە شتێکی زیانبەخش.

بەڵێ ڕۆڵەکانم! شەیتانیش لاستیکی بۆکسێنی ئێمەیە. ئەگەر بێت و هەر جارێك کە نزیکمان کەوتەوە، پێچەوانەی ئەوە بکەین کە پێمان دەڵێ و قاوی بدەین، دەبێتە شتێکی زۆر چاك و بەسوود و بەجێ بۆمان، چونکە بە هەر گوێ نەگرتنێك لە چرپەیەکی و بەجێ نەگەیاندنی هەر فەرمانێکی، پاداشت وەردەگرین و لە ڕووی مەعنەوییەوە بەرز دەبینەوە. بەڵام ئەگەر وەك مشتەکۆڵەکارێکی دەبەنگ، بە ناوریایی و بێسەروبەرییەوە بەرەو

ڕووی ببینەوە و بە قسەی بکەین، گوناھەکانمان زیاد دەکەن، بەمەش وا دەکەین شەیتان بۆمان ببێتە شتێکی خراپ و سەرچاوەی زیان.

دەی با بزانین کێ وەك مشتەکۆڵەکارێکی زیت و کارزان دەبێ، بەوەی ھەر جارێك شەیتان توخنی کەوت مستێکی لێبدات، کێیش بە دەستییەوە لێدان دەخوا و خۆی ڕەنج بە خەسار دەکات؟ گەورەترین تاقیکردنەوەی ژیانی دونیاش، ھەر ئەمەیە. ئەوەشمان لەبیر نەچێ: لێدان خواردن بە دەستی شەیتان، زۆر لە ھی مرۆڤ خراپترە، چونکە مستی شەیتان دەموچاومان نا، بەڵکو زۆر لەوە گرنگتر، ڕۆح و ویژدان و دڵ و دەروونمان و لەڕێی ئەمانەشەوە باوەڕمان دەپێکێ و نابەڵەدی دەکات.

## سەربازە گیان لەسەر دەستەکانی شەیتان

کەسێك ببێتە سەربازی شەیتان و بەردەوام بەدوایەوە بێت، ئەوا دەستی لە مرۆڤایەتی کێشاوەتەوە و، بە ئافەریدەیەکی دی دێتە ئەژمار. ھەندێك لەوانە، لە دڵەوە ڕازین بە بوونە ئافەریدەیەکی دی. تۆ بڵێی بۆ؟ چونکە ئەمانە بونیادیان شێواوە و خاسیەتە بنچینەییەکانیان لەدەست داوە، چی تر بە مرۆڤیی نەماون و دەستیان لە مرۆڤایەتیی کێشاوەتەوە، لەجیاتی ئەوەی چێژ لە

چاکەکاری وەربگرن، لە خراپەکاری وەریدەگرن. پتر هەست بە خۆشیی دەکەن بەوەی گوێڕایەڵیی شەیتان بکەن، نەك خودا.

یەکێك لەم جۆرە مرۆڤانە، زۆر هۆگری شەیتان بووبوو و زۆری خۆش دەویست... بیری لەوە دەکردەوە، دەبێ ئەو سیمبولی خراپەکارییە چۆن بوونەوەرێك بێت، چۆن کارەکانی هەڵبسووڕێنێ؟ چۆن بتوانێ کار لە مرۆڤ بکات؟

تا ئەوەی ڕۆژێکیان بوونەوەرێکی زۆر سەیری لێ پەیدا دەبێ... ئەمیش بە کەمێك ترس و سەرسامی و کەمێك عەوداڵییشەوە، لێی دەپرسێ:

– ئەرێ تۆ کێیت؟

– شەیتانم.

– ئەوە بەڕاستتە؟! زۆر خۆشحاڵ بووم بە دیدارت. نازانیت چەندم خۆش دەوێیت! تکایەکم لێت هەیە؟

– چییە؟

– من چەند عەوداڵی تۆم، ئەوەندەش عەوداڵی ئەوەم بزانم تۆ چۆن کار دەکەیت و چۆن خەڵکی بەرەو خراپە پەلکێش دەکەیت. دەتوانی ئەمڕۆ منیش لەگەڵ خۆتدا بگێڕیت و پێم نیشان بدەیت چی دەکەی؟



● هەنـدێك كـەس سـەربازی گیـان لەسەردەسـتی شـەیتانن، لەجیاتی چاکەکاری چێژ لە خراپەکاری وەردەگرن.

ئەویش پێی دەڵێت:

– بەڵێ، بە خۆشحاڵییەوە!

ئیدی دەکەونە ڕێ. شەیتان ڕێگەی هەموو گوناه و تاوانەکانی پـێ نیشان دەدات و فێری دەکات کە چۆن خەڵکیان بۆ هەڵدەنێ...

ئەو پیاوە کە لە گوناهکـاری چـێژی وەردەگـرت، لـەو هاوەڵییـەی شەیتان زۆر ڕازی دەبێ.

کە ئێوارە دادێ، شەیتان پێی دەڵێت:

– بۆ ئەمڕۆ، ئەوەندە بەسە!

کـابرا تـا بڵێـی خۆشـحاڵ دەبـێ و، وەك ئـەوەی حـەز نـەکا لێـی دابڕێ، پێی دەڵێ:

– باشە، بەس ئەمە دوا پرسیارمە لێت. بەر لەوەی لێك دابـڕێین، وەڵامێکی ئەمەشم بدەوە.

شەیتانیش پێی دەڵێت:

- بڵێ بزانم.

- بەن و گوریسی جۆرا و جۆرت بەقەدەوەیە. پێم ناڵێی ئەوانە بەکەڵکی چی دێن؟

شەیتانیش بە پێکەنینەوە پێی دەڵێ:

- بەمانە مرۆڤەکان دەبەستمەوە، تا بەدوای خۆمیان بخەم و بیانهێنمە سەر ڕێبازی خۆم.

کابراش بەسەرسوڕمانەوە پێی دەڵێ:

- ئەی بە درێژایی ڕۆژێك منت لەگەڵ خۆتدا هێنا و برد، هیچ بەوانەش نەتبەستمەوە...



شەیتانیش بەر لەوەی لەبەر چاوان ون ببێ، بە کابرا دەڵێ:

- من ئەمانە لەوانە دەخەم کە نایانەوێت شوێنم بکەون. بۆیە ئەم گوریسانە بەکاردێنم، تا زۆریان لێبکەم.

بەڵام تۆ و هاوشێوەکانت سەربازی گیان لەسەر دەستی منن، چ پێویست دەکات بتانبەستمەوە؟ خۆ ئێوە خۆتان بەدوامدا دێن!

***

بەڕاستی وایە... کەسانێك هەن کارئاسانی بۆ شەیتان دەکەن، بەئاسانی دەکەونە داوییەوە و دوای دەکەون، ئای چەند داماون!

وەك پێشتریش ئاماژەم پێدا، هەندێك کەس لەوەش خراپترن... هیچ پێویست ناکات شەیتان ڕایان بکێشێ و ڕێی خراپەیان پێ نیشان بدات. ئەوان خۆیان بەدوای خراپەکاریدا دەگەڕێن و خەڵکی تریش بۆ خراپەکاری کێش دەکەن. بەم جۆرە ئەرکی شەیتان لە ئەستۆ دەگرن، شەیتانیش بەوپەڕی ئاسوودەییەوە لە پشوویەکی درێژدایە.

ئای ئەو جۆرە کەسانە چەند داماو و ڕەنجبەخەسارن ؟!!

## شەیتان کۆسپێکە لە تاقیکردنەوەی دونیادا

شەیتان کۆسپێکی کاریگەرە لەسەر ڕێی ژیاندا، ژیانیش پێشبڕکێ و تاقیکردنەوەیە. ئەمها پێشبڕکێی کۆسپدار هەیە، ژیانیش ئا لەوانەیە... جا با بزانین کێ لەو کۆسپانە گیر دەبێ و دەکەوێ، کێیش بە سەریاندا باز دەدا و خۆی دەگەیەنێتە کۆتا...



● توانای مرۆڤ بەپێی سەرکەوتن بەسەر ئەو کۆسپانەی دێنە پێشی، زیاد دەکات.

– ئەرێ پێم بڵێن، کۆسپەکانی گۆڕەپانی مەشقی سەربازیتان بینیوە؟

دەبینن جێ جێ کۆسپی جۆرا و جۆر گۆڕەپانەکەی داگرتووە. لە شوێنێك بەرزاییەك هەیە، دەبێ بە سەریدا بازبدەی. ئینجا چاڵاییەکە، دەبێ خۆت هەڵبدەیتە ناوییەوە و دواتر بێیتە دەرەوە. پاشان پەیژەیەك دێ، دەبێ پێیدا هەڵگەڕێیت... هەروەها چەندین کۆسپ و لەمپەری تر. بێگومان ئەمانە بۆ ئەوە دانەنراون، ئازاری سەربازە مەشقکارەکانیان پێبدرێ، بەڵکو هەر یەك لەمانە توانای جووڵەی ئەندام و ماسوولکە

بەهێز دەكات. وەك چۆن ئەم گۆڕەپانی مەشقە وا دەكات هێز و توانای سەربازەكان زیاد ببێ و بەمەش ئەگەری سەركەوتنیان زیاد بكات، ئاواش هەندێ كۆسپی گۆڕەپانی ژیان سوودیان هەیە بۆ بەهێزكردنی ئاكار و باوەڕی موسوڵمان.

یەكێك لەو كۆسپانەش شەیتانە، بگرە یەكێكە لە گەورەترین كۆسپەكانی ڕێ. نەفسی مرۆڤیش كە گەلێك عەوداڵی بەدكارییە، باشترین داردەستی شەیتانە... بۆیە دەبێ لە بەرانبەر ئەم دانوستانەی ئەو بەدكارانە (نەفس و شەیتان) خۆڕاگر بین و چۆك دانەدەین. ئەگەر نا، وەك یاریزانێكی مەشق نەكردوومان لێدێ و لەو كۆسپانە گیردەبین و دەكەوین.

ئەوانەی بە شەیتان و فێڵەكانی ئاشنان و بەردەوام هەڵوێستی لە بەرانبەر وەردەگرن و ڕووبەڕووی دەبنەوە، زۆر بەسانایی بەسەر كۆسپی شەیتاندا بازدەدەن و تێیدەپەڕێنن. ئێ خۆ ڕووبەڕووبوونەوەی شەیتانیش، ماندووبوون و ئارەق ڕشتنی تێدایە. بەڵام كە ئەو لەمپەرە دەپەڕێنی و ناهێڵیت شەیتان بەسەرتدا زاڵ ببێت، هەست بە تامێكی هێندە خۆش دەكەیت، كە هەر قابیلی تام كردنە، چونكە ئەمە ئەو تاقیكردنەوەیەیە كە مرۆڤ لەسەر ئیرادە و خۆڕاگری خۆی دەیكات. هیچ شتێكیش لەوە خۆشتر نییە كە لە تاقیكردنەوەی باوەڕ و ئیرادە دەربچیت.

# گەورەترین تەڵەی شەیتان

– مامۆستا! وتت فێڵەکانی شەیتان، ئەو فێڵانە چین؟ شەیتان چۆن تەڵە بۆ مرۆڤ دادەنێتەوە؟

– پرسیارێکی زۆر جوانە، بەڵام ئەم هەویرە زۆر ئاو دەکێشێ و کاتەکەمان بەشی ئەوە ناکات... بەڵام با فێڵێکی سەیری شەیتانتان بۆ باس بکەم:

شەیتان هەندێ جار هەر بۆ ئەوەی وا لە مرۆڤ بکات لەسەر گوناه و تاوانکاری ڕابێت، وای لێدەکات نکوولّی لە بوونی خۆیشی بکات، بەو مانایەی کەسی گوناهکار دەڵێ: "شتێك نییە بە ناوی شەیتان"، بەم جۆرە خۆی لەوە دەبوێرێ کە شوێن کەسێکی بەدکار کەوتبێ و، بە کەیفی خۆی گوناه ئەنجام دەدات. کەواتە یەك لەو هەموو فێڵ و گزیکارییەی شەیتان، ئەوەیە کە وا لە خەڵکی دەکات نکوولّی لە بوونی خۆیشی بکەن. بەم ڕوونکردنەوەیە یەکێك لە زیرەکترین قوتابییەکان هەڵیدایێ و وتی:

– مامۆستا! دیارە شەیتان خاکەڕایی (تواضع) دەنوێنێ؟

– بۆ؟ بە چیدا دیارە؟

– مامۆستا! تۆ لە وانەیەکی پێشووماندا باسی ئەوەت کرد کە شەیتان بە هۆی لەخۆ ڕازیبوون و خۆبەگەورەزانینییەوە، بەر

نـەفرەتی خـودا کـەوت و دەرکـرا. ئەمـەش ئـەوە دەردەخـات کـە خۆبەشتزانین و خۆپەرستی و لەخۆباییبوون چ خووگەلێکی قێزەونن و هەمووشـیان لـە ئەسـڵدا هـی شـەیتانن. هەرچـی خاکـەڕایی و خۆبەگەورە نەزانینیشە سیفەتی پێغەمبەرانن(سەلامی خوایان لێ بێ).

بەڵام ئێسـتا باسـی ئـەوە دەکـەیت شـەیتان تەنانـەت بـە نکـووڵی کردن لە بوونیشی ڕازییە، بگرە خۆیشی داوای دەکات. مەگەر یـەکێك بەمە ڕازی بێ، ناکا خاکسـارە؟ ئـەی ئەمـەی شـەیتانیش خاکسـاریی نییە؟

– نەخێر ڕۆڵە!... بەڵکو ڕێك بەپێچەوانەوە... ئەو دەیەوێ خـۆی لە پشت ئـەو نکـووڵی کردنـەوە حەشـار بـدات. بەمـەش هێنـدەی تـر مرۆڤـەکان بخاتـە ژێـر کاریگـەریی خۆیـەوە و بـەدوای خۆیـان بـدات. چونکە ئەوەی بزانێ شەیتان هەیە و بیناسێ، لـە خـۆی و فێڵـەکانی دەترسێ و هەوڵ دەدات خۆیان لێبپارێزێ، بەم جۆرە بەوریاییـەوە ڕووبەڕووی دەبێتەوە. بەڵام کەسێك نکووڵی لـە بـوونی بکـات، ئـاوا ئاگاداری نابێـت. چـونکە پێـی وا نابێـت وەهـا بوونـەوەرێك هەیـە و لەسەرپەتی لە دەستی ڕا بکات. کەواتە ئەمە ئەوەی لێناخوێنرێتـەوە کە شەیتان خاکەڕایی دەنوێنێ و مەیدانی چۆڵ کردووە، بـەڵکو ئـەوە تەڵەی ناوەتەوە تا بتوانێ چاکتر کارەکانی بەجێ بگەیـەنێت... ئەمـە

هیچ پەیوەندییەکی بە خاکسارییەوە نییە، بەڵکو فێڵێکە و ئەقڵ پەی پێنابات.

ئەوەشمان لەیاد نەچێت، ئەوەی باوەڕی بە بوونی شەیتان هەبێ، لە شەڕ و بەڵای دەترسێ و هەمیشە لە ئاستیدا چاوکراوە دەبێ، لە خودا دەپاڕێتەوە لە خراپەکارییەکانی شەیتان و نەفسی خۆی، بیپارێزێ، بەڵام یەکێك باوەڕی بەوە نەبێ شەیتان هەیە، بە پێویستی دەزانێ دوعایەکی وا بکات؟!

کەواتە وەك چۆن ئەوەی باوەڕی بە بوونی فریشتەکان هەیە، هەوڵ دەدات وەك ئەوان بێگەرد و بێگوناه بێت، کەسێکیش باوەڕی پێیان نەبێت، نکوڵی دەکات لەوەی بوونەوەرانێکی وا نموونەیی هەبن کە پێویست بکات خۆی وەك ئەوان لێبکات. بە گوزارشتێکی تر: ئەوەی باوەڕی بە فریشتە هەبێ، هەوڵ دەدات وەك ئەوانی لێبێت، ئەوەشی باوەڕی بە بوونی شەیتان هەبێ، هەوڵ دەدات خۆی لە بەدکارییەکانی بەدوور بگرێ و نەکەوێتە داوییەوە. بۆ بوون بە فریشتەش، مەگەر پێویست ناکات خۆت لە شەیتان بەدوور بگریت؟

پێویستە لەدەست فەرمانە خراپەکانی هەڵبێی، بە هەر هەڵهاتنێکیش لەدەست فەرمانەکانی، خێری پەرستشێکت پێدەگات.

با « هەڵێ و ببەوە» دروشممان بێت، تا بتوانین خۆمان ڕزگار بکەین. ئەگەر توانیمان لەدەستی هەڵبێین، زۆر و زەوەندیی

گوناهـەکان، بۆمـان دەبنـە هـۆی بەدەسـت هێنـانی خێـر و پاداشـتی زیاتر.



● مرۆڤ کە توانی لەدەست گوناه هەڵبێ، ئیتر گوناهـە زۆر و زەوەنـدەگانی پێشـووی ، تـەنها دەبنـە هـۆی ئـەوەی خێـر و پاداشتی زیاتری دەست بکەوێ و هەستی مرۆیی زیاد بکات.



## (ئەسلی)یەکان دەگەڕێنەوە سەر ئەسڵیان

دوای چەند ڕۆژێك (ئەسلی) - ئەو قوتابییەی کە پرسیی: "مەگەر شەیتان خاکەڕایی دەنوێنیٚ؟"- هاتە لام. لەبەر زیت و وریاییەکەی، زۆرم خۆش دەویست. لەو وانەیەماندا جارێکی تر پێم وتبوو: "ئافەرین کچەکەم! تۆ دەبیتە موسوڵمانێکی نموونەیی".

بەپێچەوانەی پێشووی، بە سڵەمین و شەرمەوە وتی:

- مامۆستا گیان! تۆ لە وانەی ڕابردوودا بە منت وت: "موسوڵمانێکی چاك و نموونەیی". لەو ڕۆژەوە هەر خەریکی بیرکردنەوەم. وا دیارە من وەك ئەوەی هەم، لە دەرەوە دیار نیم و تۆم بەهەڵەدا بردووە. کە بیرم لەمە دەکردەوە، ئۆقرەم لێهەڵدەگیرا. وام پێباش بوو ڕاستیی خۆمت پیٚ بڵێم تا دڵم ئۆقرە بگرێت.

- ئەو ڕاستییە چییە؟ بیڵێ، بەڵام دڵنیابە ناتوانی ئەم ڕایەم پێ بگۆڕیت. کەسێکی دڵپاك و زیرەك و ڕەوشت بەرز و شەیدای ڕاستیی وەك تۆ، ناکرێ بە جۆرێکی تر لێی بڕوانرێ. من وا بەئاسانی لە بیروڕاکانم پاشگەز نابمەوە. وەلێ دیسانیش ئەوەی دەتەوێ بیڵێیت بیڵێ...

- مامۆستا گیان! نازانم...، بەڵام ئەوە دەزانم کە من موسوڵمانێکی ئاسایی نیم. چونکە من هەندێ شت دەکەم، لەگەڵ ئایینەکەماندا یەك ناگرێتەوە. بۆ نموونە: من مایۆ لەبەردەکەم و دەچمە سەر دەریا. ئەمە سەرباری ئەوەی نوێژەکانیشم بەتەواوی بەجێ ناگەیەنم.

- سەیرکە ئەسلی! دەستخۆشیت لێدەکەم بۆ ئەم بیرکردنەوانەت، چونکە ئەوە دەگەیەنن دەتوانی بەسەر خۆتدا زاڵ ببیت، دەتوانی کردەوەکانت هەڵبسەنگێنی. وەك لە قسەکانتدا دیارە، لەو شتانەی بە خراپیان دەزانی دڵتەنگیت و حەزت لە کار و کردەوەی چاکە. ئەمانە هەستگەلێکی جوانن کاریگەریی ئیمان و ئیسلامن بەسەرتەوە. کەواتە ئەوەندەش بەهەڵەدا نەچووومە کە تۆم بە موسوڵمانێکی چاك داناوە.

ناشبێت پێمان وا بێ «موسوڵمانی بێگوناه» هەیە. هەر موسوڵمانە و بابیی خۆی هەڵە و کەموکوڕی و گوناهی هەیە. چونکە

موسـولْمانيش مرۆڤـه، نـەك فريشـتە. كـاتێكيش خـودا بەنـدەكانى هەڵدەسەنگێنىٚ، لەبەر يەك – دوو گوناه نايانخاتە دۆزەخەوە. بەڵكو چاكە و گوناهەكان دەكێشرێن و دەپێورێن، كاميان قورسـتر بێـت و لەوى ديكە زياتر بێت، ئەوى ديكەى بۆ حسێب ناكرێت.

لە لايەكى تريشەوە، گوناهـەكانيش وەك نمـرەى سـەر كـارت وان. نمرەى كەوتووى وانەيەك كار ناكاتە سەر نمرەى باشى وانەيـەكى تـر. بۆ نموونە: ئەگەر يەكێك لـە وانـەى زمـانى تـوركى بكـەوێت، خـۆ بـەو هۆيەوە لە بيركاريش ناخرێت.

قوتابى تەنها لەو وانانەى كەوتووە دەمێنێتـەوە بـۆ خـولى دووەم، لـــەوانى ديكـــە دەردەچـــێت. هـــەر وەك ئەمـــە، نوێـــژ و ڕۆژوو و خووڕەوشتەكان و هەڵاتن لە خراپـەكارى... و هتـد، هـەر يەكـەو وەك وانەيەكن. با بزانين لە چەند وانە دەردەچين و لە چەنديش دەكەوين؟ خۆ ئەگەر نمرەى وانە گرنگەكان و تێكڕاى گشتيى نمرەكان باش بـن، دوور نييە مامۆستاكان يەك – دوو وانەى كەوتوو ڕاست بكەنەوە.



ئینجا خودا لێبوردەیە و پێغەمبەریش (درودی خودای لێبێت) شەفاعەتی هەیە و حەز ناکات کەس بچێتە دۆزەخەوە. پێویستە ئەمانەشمان لەبەرچاو بێ، تا بێ ئومێد نەبین. هەڵبەتە ناشبێ بە هۆی ئەمانەوە خەمساردی و تەمبەڵی بنوێنین. چونکە هەر وەك ئەو قوتابییەی ناتوانێ لە خولی دووەمیش دەربچێ، کەسێکی واش شایستەی لێخۆشبوون نابێ.



● لە ڕۆژی پەسلاندا چاکە و خراپەکان دەکێشرێن. کامیان قورستر بێت، مرۆڤ بەگوێرەی ئەوە پاداشت وەردەگرێت.

گرنگ ئەوەیە بە کارە خراپەکانمان دڵتەنگ بین و پەشیمان ببینەوە لێیان. ئەوەی گوناهکاریی پێ خراپ بێ و کاتێکیش ئەنجامی دا، پێی دڵگران ببێ و فرمێسکی بۆ بڕێژێت، لێیان پاك دەبێتەوە، بەو مەرجەی جارێکی تر نەگەڕێتەوە سەریان. بێ ئومێد بوون بە هۆی گوناهبارییەوە، کارێکی هەڵەیە. چونکە ئومێد بڕان لە خودا، خۆی بۆ خۆی گوناهێکی گەورەیە. ئێمە خودایەکمان هەیە خاوەن بەزەیی و بەخشندەییەکی بێ کۆتایە...

ئەسڵی! تۆ هەوڵ بدە لە خراپەکاریی هەڵبێی... لەوەش کە نەتوانی هەڵبێی، لە دڵەوە هەست بە پەشیمانی بکە و هەوڵ بدە دووبارەی نەکەیتەوە. نییەتی ئەوەی لێبێنە کە پەرستشەکانت بەڕێکی ئەنجام بدەیت و زیاتر لە گوناهەکان هەڵبێی. من تۆ وا دەبینم، هەر بۆیەش بە موسوڵمانێکی کامڵت دادەنێم.

– زۆر سوپاست دەکەم، مامۆستا گیان! منت لە دەردێکی گران ڕزگار کرد. خودا یار بێ، ئەوەی نەمکردووە دەیکەم و دەبمە موسوڵمانێکی نموونەیی. بەم قسانەت بۆم ڕوون بووەوە کە بەڕاستی دەتوانم ببمە موسوڵمانێکی نموونەیی.

ئەسڵی لە ترس و سڵەمینەکەی ڕزگاری بووبوو و چاوەکانی دەبریقانەوە. ئومێدەوارم (ئەسڵی)یەکان بگەڕێنەوە سەر ئەسڵیان، ئەمڕۆ جارێکی دیکە گیانی بەبەردا هاتەوە و ژیایەوە... هەر بژی ئەسڵی...



# ئەو پیاوەی پاپۆڕەکەی (قازی کۆی) بەجێی هێشت

من هەردەم هەریەك لە فەرزەکانی ئیسلام بە وانەیەك دەچوێنم. بەم جۆرە لە ژێر زۆر پرسیار بەئاسانی ڕزگارم دەبێ.

کە هەر فەرزە و وانەیەك بوو، مانای وایە ئەو دەفتەری تۆماری چاکە و خراپەیەی فریشتەکانی (کِرَامًا کَاتِبِینَ)ـیش وەك کارتی لێدێت... دەرچوون بەهەشتە و کەوتنیش دۆزەخ...

یەك لەو ڕۆژانەی کە ئەم لێکچواندنە زۆر بەکەڵکەم بەبیردا هات، هەرگیز لەیاد ناکەم. چونکە ئەو ڕۆژە دۆستێکی پێبەخشیم کە تا ئێستاش دۆستایەتییەکەمان درێژەی هەیە.

لە پۆلی حەوتی بنەڕەتی بووم و باسی نوێژم بۆ دەکردن. کاتێ بە باس کردنی سوودەکانی نوێژ کۆتاییم بە وانەکە هێنا، چاوەکانی (خولیا) پڕ فرمێسك بوون. سەرنجی ڕاکێشام، چونکە وەك جاران وریا و چالاك نەبوو.

دەرکەوت بەهەڵەدا نەچووبووم. کە لە پۆل دەرچووم بەدوامدا هات. چاوەکانی ئەوەندەی تر ئاویان تێزابوو، بە دەنگێکی پچڕ پچڕەوە لێی پرسیم:

– مامۆستا! نوێژ یەکێکە لە پایەکانی ئیسلام، وا نییە؟

– تۆ سەیری خولیا بکە! ئەی چەند دەرسە چی دەڵێین؟!

– مامۆستا! بەپێی ئەوەی پایەیەکی بنەڕەتی ئیسلامە و فەرمانی خودایە، هەر دەبێ بکرێت، وا نییە؟ بەڵام زۆر کەس هەن نایکەن، حاڵی ئەوان چی دەبێت؟

– ئەوەی نەیکات، لە وانەی نوێژ دەکەوێت. ئەگەر دواتر قەزای نەکاتەوە و لێبووردنی خودایی بەدەست نەهێنێت، سزاکەی دەچێژێت.

– لە کوێ دەیچێژێت؟

– گومانی تێدا نییە شوێنی سزا لە ڕۆژی دواییدا دۆزەخە، ئا لەوێدا.

خولیا سوپاسی کردم و ڕۆی. سەرم سوڕمابوو، تێنەدەگەیشتم مەبەستی چی بوو!

ئەوە بوو دوای چەند ڕۆژێك، دیسان لە کاتی پشووی نێوان وانەکان و لە کاتێکی زۆر تەنگدا هاتەوە لام. هەمان پرسیارەکانی جارەکەی دیی دووبارە کردەوە. دەیویست بزانێ داخۆ نوێژنەکەر،

ئەگــەر لــە ڕووی ئاكــارەوە زۆریــش كامــڵ بێــت، هــەر دەخرێتــە دۆزەخەوە:

– كەسێكە تا بڵێی ڕێكوپێكە، لەگەڵ هـەموو كەسێكدا دەسازێ، هیچ ناهەقییەك ناكات، چاوی لە حەرام نییـە، هـەموو قوربانییـەك لـە پێناوی ماڵ و منداڵیدا دەدات، بەڕۆژووش دەبێت...

قسەكانم پێ بڕی و وتم:

– خولیا! ئێستا ئەم پێـنج دەقەیە كـارم هەیـە. وەك پێشـتریش وتوومـە: كەسـێكی وا، وەك ئـەو قوتابییــە وایــە كــە لــە زۆر وانــەدا دەرچووە، بەڵام لە وانەیەك (بۆ نموونە بیركاری) كـەوتووە، بـە هـۆی چاكیی لەوانی تر، ڕزگاری نابێت.

بەڵام ئەو هـەر مێشـكی دابـووی لـە سـزای نوێـژ نـەكردن، دیسـان هەمان پرسیاری كردەوە:

– مامۆسـتا! یـەعنی كەسـێكی وا هــەر لــە دۆزەخــدا ســزاكەی دەچێژێت؟...

من چیی تر درێژەم پێنەدا، چونكە كاتم نەبوو. یەكسەر وەڵامێكی كورت و یەكلاكەرەوەم دایە ئەو خولیایەی بە چاوی پڕ لـە ئەسرین و پەرۆشییەوە تێیدەڕوانیم:

– بەڵێ، سزاكەی دەچێژێت.

لەبەر ئەوەی هەستم کرد زۆر تێکچوو، ئەمانەشم بۆ قسەکانم زیاد کرد:

- بەڵام دوا جار، لەبەر ئەوەی کەسێکی باوەڕدار و ئاکار جوان بووە، دەخرێتەوە بەهەشتەوە...

- بەڵام مامۆستا! ئەو هەر چی کاری چاك هەیە دەیکات، کەسێکی تا بڵێی باشە، نوێژ خوێنانیشی زۆر خۆش دەوێت، بەس ئەوەندەیە خۆی نوێژ ناکات.

- باشە مادام کەسێکی ئاوا موسوڵمان و ڕێکوپێکە، بۆچی نوێژ ناکات؟ دە با لەگەڵ هەموو ئەو کارە باشانەی دەیانکات ئەمەش بکات، تا ببێ بە کەسێکی باشتر. ئەگەر نا وەك ئەو پیاوەی لێدێ کە پاپۆڕەکەی (قازی کۆی) جێی هێشت.

- مامۆستا ئەوە یەعنی چی؟

- سەیر کە خولیا! بیر لە پیاوێك بکەوە کە لە شاری (وان)ە، دەبێ بچێت بۆ ئەستەنبووڵ، بۆ ئەنجامدانی کارێکی کە دەبێ هەر ئەو ڕۆژە بەئەنجامی بگەیەنێت. با بڵێین پێویستە کاژێر دەی بەیانی لە دادگای ئەستەنبووڵ ئامادە بێت. ئەم کابرایە بە خێراترین هۆکارەکانی گواستنەوە، خۆی دەگەیەنێتە (قازی کۆی). سەیری کاتژمێر دەکات کاژێر هەشتە، هێشتا دوو کاژێری ماوە. بە نیو کاژێرێك دەتوانێ بگاتە ئەوبەر و بچێتە دادگا و داواکەی بگەیەنێت. لە

خۆشیی ئەوەی زوو گەیشتووەتە جیّ و بە هۆی ئەوەی لەو ڕێیە دوور و درێـژە زۆر مانـدوو بـووە، لەسـەر قەنەفـەی هـۆڵی چـاوەڕوانیدا دادەنیشێ، ئەوەنـدە نابـات خـەو دەیباتـەوە. کاتێـك بـەئاگا دێتـەوە دەبینـێ کاژێر یانزەیە، نە دەعوا ماوە نە هیچ، هەموو ئەو ڕاکـە ڕاك و ماندووبوونەی بەفیڕۆ دەچێت.

ئا ئەو کەسەش کە هەرچی کاری باش هەیە دەیکات، گوناه ناکات و بەڕۆژووش دەبێ، بەڵام نوێـژ ناکـات، هـەر وەك ئـەم کابرایـە وایـە. ئەویش لە ڕێی سـەفەری ژیـانی دونیـادا هـەموو شـتێك بـەجێ دێنـێ، بەڵام گرنگترین شتی کۆتایی لەبیر دەچێت. کەواتـە دەتـوانین بڵـێین:

ئەو پیاوە باشانەی نوێـژ ناکـەن، وەك ئەو پیاوە وان کـە پاپۆڕەکـەی (قـازی کۆی) جێی هێشت، ڕەنگە دەعواکەیان لەدەسـت بچـێ و هیچـیش دوور نییـە سزا وەربگرن.



خولیا لەبەر خۆیەوە هەر دەیوتەوە "ئەو پیاوەی پاپۆڕەکەی قازی کۆی جێی هێشت" و ڕۆیشت. وای بـۆ چووم، هەبێ و نەبێ ئەو کەسەی باسی دەکرد، خۆی بوو.

ئـەوە بـوو چـەند ڕۆژێـك دواتـر، یـەکێك هـاتبووە قوتابخانـە بـۆ سەردانییم. قوتابییە ئێشکگرەکان خەبەریان دامێ.

وتم:

– پێی بڵێن با بێت.

بەڵام قوتابییەکان وتیان: ئەو دەیەوێ لە خوارەوە و بەتەنها بمبینێت. وتم "خێرە ئیشەڵڵا" و چوومە خوارەوە. وتم ڕەنگە باوکی قوتابییەك بێ.

خۆم لە بەرانبەر پیاوێکی تەمەن ناوەندی ڕووخۆش و دەم بە خەندە بینییەوە، وەك ئەوەی دۆستی گیانی بە گیانی یەك بین، بزەی بۆم دەکرد.

سڵاومان لە یەکتر کرد و دەستی یەکمان گوشی. وتم:

– ببوورە ناتناسمەوە.

هێندەی تر خەندە کەوتە سەر لێوانی و وتی:

– ئەمە یەکەم دیدارمانە، بەڵام لە دوورەوە دەمناسیت.

زۆرم هەوڵ دا بیناسمەوە، بەڵام ئەو مەراقەکەی نەهێشتم و وتی:

– من ئەو پیاوەم کە پاپۆڕەکەی قازی کۆی بەجێی هێشت...

خودا باشی بۆ هێنابووم، بۆ کازێرێك دەرسم نەبوو... کەوتینە ڕاز و نیاز. بۆم ڕوون بووەوە باوکی خولیایە. کچەکەی زۆری لێکردبوو دەست بە نوێژ کردن بکات تا نەچێتە دۆزەخەوە، چونکە خۆی و دایکی نوێژیان دەکرد و، وەك تاکە منداڵی خێزانەکەی زۆر حەزی

دەکرد لە بەهەشتیش هـەموویان پێکـەوە بـن. کـە بـۆی دەرکـەوتبوو ناتوانێت قەناعەت بە باوکی بهێنێت، بۆ لای منی ناردبوو.

کاک (ئایدن) کە ڕۆیشـت، زۆر خۆشـحاڵ بـوو و گفتـی دا نـەهێڵێت پاپۆڕەکەی قازی کۆی جێی بهێڵێت...





# نامەکەی (ئەسەنگوڵ)

مامۆستای ئازیزم!

هەموو جارێک بە پرسیارگەلی پڕ لە گومان ڕووبەڕووی ڕوون کردنەوە جوانەکانی تۆ دەبمەوە. توخودا لێم زویر مەبە و دڵت لێم نەڕەنجێت... من دەمەوێ باوەڕ بێنم، باوەڕ بێنم و ئیدی ڕزگارم ببێت، چونکە زۆر باش دەزانم بەبێ باوەڕ هێنان ئەم دڵەی من ئۆقرە ناگرێ.

ئەو کاتانەی باوەڕ وەک گوڵێک لە ناخمدا دەپشکوێ، ئا ئەو کاتانە خۆشترین کاتەکانی منن، پێشم وایە لە بەدەست هێنانی ئەو خۆشییەدا قەرزداری تۆم.

بەلاَم ڕەنگە بلێیت ئەی ئەو هەموو پرسیارە پڕ لەگومانانـە چـین؟ ئەگەر قەلس بیت و تووڕەش ببیت، ناهەقت ناگرم. بەلاَم حەز دەکەم ئەوە بزانیت کە تا ئێستاش نـەمتوانیوە خۆم لـەو کاریگەرییانـە ڕزگـار بکـەم کـە بۆردومانی ئەو دونیای باوەڕە دەکەن کە تـۆ لـە ناخمـدا بنیاتـت نـاوە و، هـەوڵی ڕووخانـــدنی دەدەن. لـــە ســـەرووی هەمووشیانەوە کەسوکارەکەم، هەمیشـە پـێم دەلـێن: "هێشـتا گـەنجی بـۆ خـۆت بـژی، ئـەم زانیـاری و بیروباوەڕانـە لـە



خۆشییەکانی ژیانت دەکەن". هاوڕێکـانم پـێم دەلـێن: "دەلێـی بـۆنی بەهەشت دەکەیت!". ئەو کتێبانەی دەیانخوێنمەوە و ئـەو فیلمانـەی سـەیریان دەکـەم، باسـی سروشـت دەکـەن نـەك خـودا، باسـی ماددەگـەرایی دەکـەن نـەك بـاوەڕ، باسـی پەرەسـەندن و مـەیموون دەکەن نەك حەزرەتی ئادەم.

مامۆستا سەنگینەکەم!

زۆر بـاش دەزانم کـە بـەو هەسـت و سـۆزەوە ئـەو باسـانەمان بـۆ دەکەیت، بۆ ئەوەتە ڕزگارمان بکەیت. وەلێ ئـەوەش دەزانم کەسـانێك

هەن خەریکی تێکدانی ئەوەن کە تۆ بینای دەکەیت، بە ژمارە زۆر و زەبەندن و پێم وایە ڕێکخستنێکی تۆکمەشیان هەیە.



پێم وایە دەتوانی بێنیتە بەر چاوت کە بۆ ئێمە چەند زەحمەتە بتوانین بەرانبەر ئەمانە خۆڕاگر بین و لەسەر ئیسلام و ئیمان بمێنینەوە. ئەمە جگە لەوەی من کچێکی گەنجم، کە ئەمەش هێندەی تر مایەی زەحمەتییە، بەڵام وێڕای ئەو هەموو زەحمەتییانەش، کە جەنابتان دەبینم هێزی خۆڕاگریم زیاد دەبێ و خۆم بە بەهێز دێتە بەرچاو. لە بیرمە جارێکیان وتت کاتێك پێغەمبەر (دروودی خودای لێبێت) دەستی بە بڵاوکردنەوەی ئەم ئاینە کرد بە تاقی تەنیا بوو. هەرگیز ئەمەم لە یاد ناچێت. خۆ من وا تەنهاش نیم.

سەیر دەکەم تۆ وا بە ئاسوودەیی و دڵخۆشییەوە وانە دەڵێیتەوە، دەڵێی هەموو خەڵکی وەك تۆ بیر دەکەنەوە و پشتیوانیت لێدەکەن. ئەمەم زۆر بەدڵە، پێشم وایە بە هۆی هێزی باوەڕەوەیە کە بەو ورەیەوە هەوڵی ئەوە دەدەیت ڕزگارمان بکەیت تا هەر یەك لە ئێمە ببێتە موسوڵمانێکی چاك و نموونەیی. کەس دەتوانێ ئەم هەوڵە

مەزن و پیرۆزەتان بەرز نەنرخێنیٚ و بەشداری هەستەکانت نەبیٚ؟!
باوەڕ بکە شەوی وا هەیە تا بەیانی خەوم لێناکەویٚ و بەدرێژاییی ئەو شەوە هەر لەگەڵ تۆدا خەریکی قسەکردنم، ئەوانەت بۆ باس دەکەم و لێت دەپرسم کە نەمتوانیوە لە پۆلدا بۆتی باس بکەم و لێتی بپرسم، ناخی خۆمت بۆ هەڵدەڕێژم، بۆچی بۆ تۆ؟
چونکە تۆ بیٚ ئەوەی هیچ نیازێکی خراپت لە دڵدا بێت و بیٚ هیچ حیساباتێکی ژێربەژێری لێم نزیك دەبیتەوە. هەست دەکەم هێندەی دایك و باوکم لێم نزیکیت. جا کیٚ دەزانیٚ چەند شەو بە وتووێژ کردن لەگەڵ تۆدا ڕۆژم کردووەتەوە؟ کیٚ دەزانیٚ چەند شەوم بە هەنسك هەڵکێشان و فرمێسك ڕشتنەوە گەیاندووەتە سەر؟ بەڵام ئەم هەنسکانە هێمای خۆشنوودی و نەمانی گیرۆدەییەکانم بوون.
... نازانم چۆن دەتوانم لە تۆ و وانەکانت و ئامۆژگارییە جوانەکانت دابڕێم؟ ئای تەنانەت بیرکردنەوەش لەمە چەند ئەستەم و بەسۆیە؟ خۆزگە خوێندنەکەمان سیٚ ساڵ نەبوایە، بەڵکو شەش ساڵ بوایە و بگرە هەر دوایی نەهاتایە!
بەڵام مامۆستا گیان! لەو ڕۆژەدا کە لێك جیا دەبینەوە، پەیمانت دەدەمیٚ ئەوەی فێرت کردین لەیادی نەکەم. خۆ هەموو ئەوانەم یەك بە یەك لە دەفتەرێکی تایبەتیدا یاداشت کردووە و ئەوەندەم خوێندوونەتەوە و بۆ خەڵکم باس کردوون، زۆربەیانم لەبەرکردووە.

پەیمانیشت دەدەمێ کە هەوڵ بدەم یەکە یەکەی ئەو بنەما و پێوەرە جوانانە جێبەجێ بکەم و بیانخەمە بواری جێبەجێ کردنەوە.

مامۆستا سەنگینەکەم!

دوعامان بۆ بکە شایان بە تۆ و ئەوانە بین کە بۆت باس کردووین، گەردنیشمان ئازاد بکە. ئای چەند حەزم دەکرد گشت ئەم هەستانەمت ڕووبەڕوو پێبڵێم، بەڵام ئەوە ئەوەندە ئاستەم بوو، نەبێتەوە. ناتوانی بێنیتە بەر چاوت کە چەند بەزەحمەت ئەمانەم پێنووسرا، لە سەرووی هەموو ئەمانەشەوە ڕاگرتنی هەنسك و ئەسرینەکانم هەر زۆر بێئامان بوو.

لەم شەوە خۆش و خامۆشەی هاوینەدا کە هەموو کەسێك خەو بردوویەتییەوە، توانیم تەنها بەشێکی زۆر کەمی ئەوە بنووسم کە دەمویست بیڵێم. ئەمە لە کاتێکدا کە دەستم دایە قەڵەم دەمویست چی و چی بنووسم. ویستم شێوازی دەربڕینەکانیشم لە شێوازە جوانەکەی تۆ بچێت، کە کەس لێی تێر نابێت.

هەست دەکەم ئەم دێڕانە گەلێك نالایەقن بە تۆ، بەڵام دیسانیش پێم وایە تۆ بەو لێبووردەییە فراوانەی هەتە، لێم تێدەگەیت و ئەم گوزارشتە لاوازانەم لێوەردەگریت.

لە کۆتاییدا دووبارە ڕێزی بێ پایانی خۆمت پێ ڕادەگەیەنم و دەستەکانت ماچ دەکەم، مامۆستا خۆشەویستەکەم!

ئەو قوتابییەت کە بە هیچ جۆرێك قابیل بە تۆ نییە...

ئەسەنگوڵ...



● کامەرانی و پێکەوەبوونی دونیا کاتییە، گرنگ ئەوەیە لە ڕۆژی دواییشدا کامەران و پێکەوە بین.



# شارستانێتی و پەنجە گەورە

شارستانێتییەکان شوێنەواری پەنجە گەورەن.

لە پۆلی دەی ئامادەیی دەرسم هەبوو. کە چوومە ژوورەوە ویستم سەرنجیان بۆ بابەتێك ڕابکێشم. ماوەیەك بە بێدەنگی بەپێوە وەستام. هەر یەکەیان بیری بۆ بابەتێك دەچوو، وتم:

– شارستانێتی شوێنەواری پەنجە گەورەیە.

تێکڕای قوتابییەکان چاوە پڕ لە سەرسوڕمانەکانیان خستە سەرم. خەریك بوو چاوە پڕ لە ڕاڤەویستەکانیان ئۆقرەی لێ هەڵبسێت، وتم:

- بەڵێ، "مرۆڤ لە بەرانبەر نیعمەتی شارستانێتییەکان، قەرزداری پەنجە گەورەیە. بە هۆی ئەو هەماهەنگییەی پەنجە گەورەیە لەگەڵ پەنجەکانی دی، کە مرۆڤ لە بوونەوەرەکانی تر باڵاترە". ئەوەی وا دەڵێ من نیم، فکری مێژووی شارستانێتی ئەمەیە.

زۆر ئاژەڵ هەیە پەنجەی هەر نییە، ئەوەشی هەیەتی پەنجە گەورەی بە جۆرێك نییە وەك هی مرۆڤ لەگەڵ ئەوانی تردا بسازێ، تا بتوانن پێکەوە فەرمانێکی بەسوود بەجێبگەیەنن. لە کاتی خستنە گەڕی سەرجەم ئەو پلان و بەرنامانەی مێشك دایاندەڕێژێ، بەردەوام پێویستمان بە ئەموستەکەڵە (پەنجە گەورە) هەیە.

بۆ نووسین - کە دایکی زانستە و، دروست کردنی ئامێر و ئامرازە پێویستەکان و گشت چالاکییە پیشەسازییەکان، هەردەم پێویستمان بەو هەیە، بگرە لە سەرەکیترین پێویستییەکانمانە.

## ئایا پێویستە سوپاسی پەنجە گەورە بکەین؟

کە بەم جۆرە کۆتاییم بە وتەکانم هێنا، گشت قوتابییەکان سەرنجیان خستبووە سەر پەنجە گەورەیان. هەندێکیان ڕایان گرتبوو و لێی ورد دەبوونەوە، هەندێکی دیکەشیان هەوڵیان دەدا بەبێ پەنجە گەورە بنووسن.

وتم:

– ئەگــەر کەســتان ڕەخنــەی لــە قســەکانم نییــە، کــە واش دەردەکەوێ، چونکە کەس دەستی هەڵنابڕێ، با هەموومان سوپاسـی پەنجە گەورەمان بکـەین و پێزانینـی خۆمـانی بـۆ دەربـبڕین. چـونکە لەگــەڵ ئــەوەی ئەوەنــدە یارمەتیدەرمانــە لــە ڕاپەڕانــدنی ئەرکــە گرنگــەکانمان، کەچــی تــا ئێســتاش بیرمــان لــە ســوودەکانی نەکردووەتەوە و ڕێزمان لێی نەناوە.

بەجارێ کەشە جددییەکەی پۆل، بەو خەندەیـەی ڕووخسـارەکانی گرتنــەوە، شـێوا، پێکــەنین و قســەش دەسـتی پێکـرد. هەنـدێ لـە قوتابییــە بزێــوە شــیرین خووەکــان پەنجــەی خۆیــان لــە ســەر (ڕەحلــە)کانیـان چـەقاندبوو و کەوتبوونـە سـوپاس کردنـی. یـەکێك لەوانەم هەڵساندە سەر پێ و وتم:

– ئەوەی دەتوت، بە دەنگی بەرز بیڵێوە.



سەرەتا شەرمی دەکرد، بـەڵام کـە زۆر سوور بووم لەسەری، وتی:

– ئەی پەنجە گەورەم! ئای، تۆ چەند کاری گرنگت ئەنجام داوە، من ئێستا پەی پێدەبــەم، داوای لێبووردنــت لێدەکــەم و سوپاســگوزارییەکانی ڕابوردووشمــت پــێ

ڕادەگەیەنم.

هەر لەگەڵ دوا وشەی، قوتابییەکان دایانە قاقای پێکەنین، خەریك بوو ببێ بە گەرەلاوژە، بەتوندی بێدەنگم کردن، وتم:

– با لە جددییەتی باسەکەمان کەم نەکەینەوە. چونکە ئەگەر بابەتێکی وا جددی بەو فشە و ناجددییەتە قسەی لەسەر بکرێ، کرۆکی مەسەلەکە ون دەکرێ و هیچ پەندێکیشی لێوەرناگیرێ.

دوای ئەوەی دیدی هەموو ئەوانە وەرگیرا، کە بیرێکیان لا گەڵاڵە بووبوو، هەموومان پێکەوە گەیشتینە ئەم ئەنجامە:

ئەوەی کە بە جوانترین شێوە پەنجەکانی تری خولقاندووە، هەر ئەوە کە پەنجە گەورەشی خولقاندووە. چونکە پێکەوە هەڵکردن و هەماهەنگییەکی سەیر لە نێوانیاندا هەیە. ئینجا ئەوەی کە هەردوو دەستەکەشی خولقاندووە هەر ئەو زاتەیە، چونکە لە نێوان هەردوو دەستەکەشدا هەمان تەریبی و هەماهەنگی هەیە. ڕوون و ئاشکرایە بۆ ئەوە خولقێنراون تا پێکەوە جووڵە بکەن و هاوکاریی یەکتری بکەن.

کێ ئەمانی خولقاندبێ، هەر ئەوە هەموو جەستەشی خولقاندووە. ئەو پێکەوە سازان و هەڵکردنەی نێوان ناوەوە و دەرەوەی جەستەش، کە ئەقڵ لە ئاستیدا دۆش دادەمێنێ، هەر سەیر و مەزنە. جەستەی مرۆڤ بە جۆرێك دەمانگەیەنێتە بوونی «هونەرمەند»ێکی مەزن، کە هیچ جێیەك بۆ بچووکترین ڕێککەوت و لەخۆوە بوون

ناهێڵێتەوە. لە گشت لایەکی جەستەمان هونەرکاریی وا ڕەنگ دەداتەوە، لاسایی کردنەوەیان مەحاڵە.

کەواتە نەك هەر لە بەرانبەر پەنجە گەورەمان، بەڵکو لە بەرانبەر هەموو جەستەماندا قەرزداری شوکرانەی خودای گەورەین. لە ئاست ئەو کردگارەی لایەنی ماددی و مەعنەویی مرۆڤی ئاوا بە نەخش و نیگاری جوان و پێوانەی گونجاو خەلق کردووە، ئەوەندە قەرزدارین ناتوانین بیدەینەوە.

کاتێك بۆ پشوو دەرچووینە دەرەوە، چاودێری پۆل وتی:



- مامۆستا! لە سەرەتای وانەکەدا بە جۆرێك دەستمان پێکرد، دەتوت وانەی زیندەوەرزانی دەخوێنین، بەڵام دواتر دووبارە هاتینەوە سەر باسی باوەڕ و خودا و ئەوانە.

وتم:

- ئەی چۆن!... ئەگەر مرۆڤ بە چاوێکی بیناوە بڕوانێ، هەرچییەك لەم گەردوونەدا هەیە بەرەو خودای گەورەی دەبا، دەیگەیەنێت بە زاتی «ئەڵڵا». هەر بۆیەشە وتراوە:

بۆ بینایە، بۆ بینا

بە کوێر چی؟ بەو هیچ نا

نابێ مرۆڤ بینایەکی کوێر بێت. دەبێ بڕوانێت و بیر لە هونەری خودا لە پەنجە گەورە بکاتەوە و باوەڕی خۆی بەهێز بکات.



● ئەگەر تەنها پەنجە گەورەمان نەبوایە، چی و چیمان پێنەدەکرا؟ قەت بیرتان لێکردووەتەوە؟



# بوون به چاكترین

"خودا جوانه و جوانانیشی خۆش دەوێت."

فەرموودەی پێغەمبەر (د.خ)

وانەی «خووڕەوشت»مان هەبوو. پرسیارم لە قوتابییەكان كرد داخۆ حەز دەكەن لە ئایندەدا ببن بە چی؟ بەسەرە هەڵمدەساندن. زۆربەیان بەشەرمەوە قسەیان دەكرد، چونكە یەكێكیان پیشەیەكی بەرزی دەوت، هەندێك جار سەرسامی ڕووی لە پۆلەكە دەكرد و هەندێك جاریش دەنگی گاڵتە پێكردن بەرز دەبووەوە، چونكە ئەو پیشەیەیان پێڕەوا نەدەبینی. بەڵام بەرانبەر ژمارەیەكی كەمیان هیچ پەرچەكردارێكیان نەبوو. ئەوەیش كە پیشەیەكی ساكاری دەوت، بە بچووكیان دەزانی.

ئینجا من كەوتمە قسە و ئاماژەم بەوە دا كە هەموو پیشەیەك گرنگ و پێویستە، بە مەرجێك بەچاكی ئەنجام بدرێت. گرنگ ئەوەیە لە پیشەیەكی باشدا، باش و سەركەوتوو بیت. ئەگەر نا بە خراپ بەجێ گەیاندنی، هیچ بەهایەك بۆ پیشەكە نامێنێتەوە. هەموو پیشەیەك لە ئەسڵدا پێویست و بەجێیە، بەڵام پێویستە پیشەوەرەكە بەباشی و سەركەوتووانە ئەنجامی بدات.

دوای ئەو ڕوون كردنەوانە، ئەم پەخشانەی «دۆگلاس مالاچ»م پێنووسینەوە:

"ئەگەر نەتتوانی ببی بە سنەوبەرێ بەسەر كێوانەوە، دەوەنێ بە لە دۆڵدا،... بەڵام دەبێ چاكترین دەوەنی ئەوێ بیت!

ئەگەر نەشتتوانی ببی بە دەوەن، گژوگیا بە، دڵڕفێنی بە ڕێ ببەخشە...

ئەگەر نەتتوانی ببیتە ڕووەكی میسك، قامیش بە، بەڵام با گەشترین قامیشی نێو گۆماو تۆ بیت.

ناكرێ هەموومان پاشا بین، ناچارین گەدا بین. ئەركی گەورە و گچكە هەیە. ئەو كارەی هەتە، گونجاوترین كارە بۆ تۆ.

گەر نەتتوانی ببی بە شەقام، توولەڕێ بە!

نەبووی بە خۆر، ئەستێرە بە!

بردنەوە و دۆڕان پێوەر نییە.

هەرچییەك بوویت، چاكترینی بە!"

***

نابێ ئەوە لەیاد بکەین، هەرچی کار و پیشەیەکمان هەبێ، گرنگ ئەوەیە بەجوانی ڕاییبپەڕێنین، هەر ئەمەش لە موسوڵمان دەوەشێتەوە، چونکە پێغەمبەرمان (دروودی خودای لێبێت) لە فەرموودەیەکیدا (کە ئەم مانایەش هەڵدەگرێت) دەفەرموێت: "خودا جوانە و جوانانیشی خۆش دەوێت..."

ئەم فەرموودەیەشم پێنووسینەوە...

ئینجا وتم:

لەبەر ڕۆشناییی ئەم قسانە و ئەم فەرموودەیەشدا، ئێستا چ کارەین و دەبێ چی بکەین؟

محەمەد کە لەلایەن قوتابییانی پۆلەوە نازناوی «فەیلەسووف»ی بەباڵادا بڕابوو، ئەم وەڵامە جوانەی دایەوە:

– مامۆستا! ئەم فەرموودەیە هێند گشتگیر و هەمەلایەنە، داوامان لێدەکات هەموو جووڵە و هەڵسوکەوتێکمان، بگرە پێکەنین و ئاخاوتن و کەلوپەلەکانیشمان جوان بن. بە ڕای من ئەوەش دەگرێتەوە کە دەبێ دەفتەر و کتێبەکانمان جوان بەرگ بکەین و خاوێن ڕایانبگرین.



- ئافــەرین محەمــەد! بەبــەلاش ناویان نەناویت فەیلەسووف!... ئـەم فەرموودەیـە فـەرمان دەدات لەسـەر هەرچـــی جوانییـــەك کـــە هەیـــە. کورتییەکەی موسوڵمان و کاری نارێـك و ناشـیرین کوجـا مەرحـەبا! چـەندی بکریّ دەبیّ جوان و چاك و ڕێك بێت.

## مۆدیلێکی نەگۆڕ

پێغەمبەرمان (دروودی خودای لێبێـت) هـەر بـە وتـن نەوەسـتاوە، بەڵکو بەدرێژاییی ژیانیشی بە جوانترین و ڕاسترین و ڕێکتریـن شـێوە ژیاوە. ئەو بۆ ئێمە مۆدیل (نموونە)یەکی نەگۆڕە. ئەوە نییە مۆدیلات دەردەچیّ تا لاسایی بکەینەوە. بـەڵام ئـەو مۆدیلانـە هـەموو وەرزێـك گۆڕانیان بەسەردا دێت، هەرچـی مـۆدیلی ژیـانی پێغەمبـەرە (دروودی خـودای لێبێـت)، هـەرگیز بەسـەر ناچـێت، ئێسـتاش هـەر باویـەتی، چونکە جەنابی حەق دایهێناوە. ئەوە نییە پێغەمبەر (دروودی خودای لێبێت) دەفەرموێت: **"خودای گەورە پەروەردەی داوم"**. کەوا بـوو چ پەروەردەیەك دەتوانیّ هی ئـەو تێبپـەڕێنیّ؟ ئـەو مـۆدیلی جوانییـەی خـودا داینـاوە، بەسەرناچـیّ و کـۆن نـابیّ. بـە گوزارشـتی عائیشـەی

خێزانیشی "پێغەمبەر (دروودی خودای لیٚ بێت) قورئـانێكی زینـدوو بوو"، بەو مانایەی قورئان بیردۆزی هـەموو جوانییـەك دەخاتـە ڕوو و پێغەمبەریش (دروودی خودای لیٚ بێت) بە بەرجەستە كردنی لە ژیانی ڕۆژانەیدا، دەیهێنێتە بواری جێبەجیٚ كردنەوە. لـە ژیـانی خۆیـدا وەك تاقیگەیـەكی زینــدوو، جوانییــەكانی قورئــان دەردەخـا و نمایشـیان دەكات.

كەواتــە مـرۆڤ دەبـیٚ شـوێن ئـەو مۆدیلـە بكـەوێت كـە بەدرێـژاییی چواردە سەدە نەگۆڕاوە و زانستیش – كـە ڕۆژ بـە ڕۆژ پێشـدەكەویٚ، ڕاستییەكانی پشت ڕاست دەكاتەوە، یان ئـەو مۆدیلانـەی سـیٚ مـانگ جارێك دێنە گۆڕێ؟

هەڵبەتە لێرەدا مەبەستم لە مۆدیل، تەنها شێوازی جلوبەرگ نییە، بەڵكو مەبەستم شێوازی ژیانە. تەنانەت زانایـانیش زوو زوو، بـە هـۆی گەیشـتنیان بـە ئەنجامگـەلی نـویٚ، دیـد و بۆچـوونەكانیان دەگـۆڕن و ناچار دەبن دان بەوەدا بنێن كـە لـەوە پـێش بەهەڵـەدا چـوونە. تاكـە ڕێسـایەك كـە نـاگۆڕیٚ و لەخشـتە نـابریٚ و لەخشـتە نابـات و چـەند سـەدەی تێپەڕانـدووە و ئێسـتاش دۆسـت و دوژمنـی ناچـارە بڵـیٚ: "ئەمەیــە كــە ڕاســترینە"، ئـا ئــەم ڕاســترین مۆدیلــە، مـۆدیلی پێغەمبەرمانە (دروودی خودای لێبێت).



ئێمەی میللەتانی ئەوروپا، بەو هەموو توانا مەدەنییانەمانەوە، هێشتا تازە بە تازە لە دەستپێکی ئەو پەیژەیەین کە حەزرەتی موحەممەد (دروودی خودای لێبێت) گەیشتبووە سەر سەرەوەی. گومانی تێدا نییە کە لەو پێشبڕکێیەدا، کەس ناتوانێ پێشی بکەوێت.

گۆتە

***



من لەو مرۆڤە جێی سەرسامییەم کۆڵیوەتەوە. پێویستە وەك ڕزگارکەری مرۆڤایەتی بیناسێنین. (...).

وا هەر لە ئێستاوە خەڵکێکی زۆر لە نەتەوەکەی خۆم و نەتەوەکانی دیکەی ئەورووپا چوونەتە سەر ئاینەکەی موحەممەد. بۆیە دەتوانم بێژم: خەریکە ئەورووپا موسوڵمان دەبێ.

بەرناردشۆ

لێرەدا هەڵوەستەیەکم کرد و پرسیم:

– ئازیزەکانم! «سوننەت» چییە و چەند جۆری هەیە؟

بینیم جگە لە فەیلەسووفەکەمان کە کەمێك لەوەوبەر پەسنم دا، کەس دەستی بەرز نەکردووەتەوە.

وتم:

– محەمەد! بڵێ بزانم.

بەوپەڕی شێلگیری و بڕوا بەخۆبوونەوە وتی:

- مامۆستا گیان! هەموو کەس دەزانێت سوننەت چییە، بۆیە پێویست ناکات پێناسەی بکەین. بەڵام جۆرەکانی، دووانن. یەکێکیان شێوازە هونەرییەکەیە کە بێ ئازارە، ئەوی تریشیان شێوازە کۆنەکەیە کە بێگومان بەئازارە.

گوڵی خەندە لە پۆلدا کرایەوە، محەمەدیش سەری سوڕمابوو. کچەکانیش لەبەر شەرم، هەوڵیان دەدا خەندەکانیان بشارنەوە.

بابەتی «سوننەت»م لە کتێبەکانیان بۆ خوێندنەوە، ئینجا بۆم شی کردنەوە. بەتەواوی تێگەیشتن و بۆیان ڕوون بووەوە کە ئەوەی ڕابوردوو باسی سوننەتی «خەتەنە» بوو. لەوە گەیشتن کە سوننەت سەرجەم کردار و ڕەفتارەکانی پێغەمبەر (دروودی خودای لێبێت) دەگرێتەوە و بەکورتی (جێبەجێ کردنی سوننەت) بریتییە لە (جێبەجێ کردنی پەروەردە و ئاکارە جوانەکانی پێغەمبەر -دروودی خودای لێ بێت-)

فەیلەسوفەکەمان وتی:

- سوننەت ئەوەیە کە لە هەموو کار و کردەوەیەکماندا، پێغەمبەر (دروودی خودای لێبێت) بە مۆدیل (نموونە) وەربگرین.



یەکێکی دی بەم پێناسەیە کەوتە خۆ و وتی:

– سوننەت واتە لاسایی کردنەوەی مۆدیلە نەگۆڕەکەی پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێت).

یەك لە کچەکانیش جوانی پێکا کە وتی:

– مامۆستا! ئەوانەی ئێستا بە مۆدیل (نموونە) وەردەگیرێن، کەسانی بەدڕەوشتن. کە خەڵك لێیان ڕازیین، مانای وایە ڕازین لە کارە بەدەکانیشیان. کەواتە ئەو کەسانەی خۆشەویستن و لاسایی دەکرێنەوە، جڵەوی خەڵکی و بەتایبەتیش گەنجان بەرەو خراپەکاری ڕادەکێشن. بە ڕای من ئەمە گەورەترین هۆکاری تەشەنەسەندنی خراپییە لەنێو خەڵکانی ئەم ڕۆژگارەماندا.

## پتەو کردنی باوەڕ

وا دیار بوو ئەم باسە مێشکی هەموویانی تەنیبوو، ئاسۆی بیری هەموویان کرابووەوە. قوتابییەکی تر وتی:

– باشە، مامۆستا! بۆچی ئێمە ئەو پێغەمبەرە ناکەینە نموونە، کە بالاترین مۆدیلی نەگۆڕی داناوە و هەڵدەستین بەدوای مۆدیل و نموونەی دیکەدا دەگەڕێین؟

ئەو قوتابییەی لە تەنیشتییەوە لەسەر هەمان (ڕەحلە) بوو، وتی:

– موسوڵمانی چاك نیین بۆیە...

منیش وتم:

- بەڵێ وایە، موسوڵمانی چاك نیین بۆیە... وەڵامەکەت جوان و بەجێیە.

ئەسڵی خۆی پێنەگیرا، پرسیی:

- باشە، مامۆستا! بۆچی نابین بە موسوڵمانی چاك، لە کاتێکدا دەزانین موسوڵمانێتی شتێکی چاکە...؟

- مانای وایە زانین بەتەنها بەس نییە، جا زانینی ڕووکەشانە هەر هیچ! سەرەتا دەبێ باش فێر ببین، ئینجا باوەڕێکی تەواو بەدەست بێنین.

- پێویستە ئەوەی بە مێشك وەری دەگرین، بە دڵیش قبووڵی بکەین و بیخەینە بواری جێبەجێ کردنەوە. نابێت بیروباوەڕمان چاولێکەرییانە بێت، نابێت نەزانانە بێت. بەڵکو دەبێ بەو ڕاستییانەی باوەڕمان پشت ئەستوورە پێیان، باوەڕەکەمان لێك بدەینەوە و لێی تێبگەین و



● زانستی ڕاستەقینە ئەوەیە کە لە شت بپرسیت و بکۆڵیتەوە و بیخەیتە بواری جێبەجێ کردنەوە. بەبێ ئەمانە، ئەو زانستە بە مردوو دێتە ئەژمار.

سوفیانی سەوری

بە دڵ خۆشمان بوویێت و بە هی خۆمانی بزانین. ئێستا با لە خۆمان بپرسین: ئایا لە توانامانـدا هەیە باوەڕەکەمان بە شێوەیەکی زانستییانە بسەلمێنین؟

– مامۆستا گیان! دە فێرمان بکە...

ئەم وتەیە لە دوا ساتی وانەکەدا هاتە وتن و وەك هاواری گەلە مرۆڤێك بوو. وتم:

– باشە، با لە وانەکانی داهاتوومانـدا پایەکانی باوەڕ بە شێوەیەکی زانستییانە ڕوون بکەینەوە و بیان سەلمێنین، وەك چۆن تێستی پرسیارەکان دەکەین... ئەوە نییە کاتێك شیکاری پرسیارێك دەکەین، تێستی وەڵامەکە دەکەین تا بزانین بەڕاستی شیکارمان کردووە یان نا. بە هەمان شێوە، بە تێست کردنی باوەڕ و شوێن قایم کردنی دەوترێت (تحقیق الایمان). باوەڕێك بەو جۆرە بەهێز کرابێت، کەس ناتوانێ بیلەقێنێ. بە چەسپان و جێگیربوونیشی، مرۆڤ دەگاتە پلەی موسوڵمانێتیی ڕاستەقینە. کەواتە بەر لە هەر شتێك باوەڕ.

با ئەمڕۆ کۆتایی بەم وانەیەمان بێنین. هەمووتان پرسیار و تێبینییەکانتان لەسەر «باوەڕ» بۆ وانەی داهاتوو بێنن، تا بتوانین باوەڕمان بەهێز بکەین. بەڵام لە بیرتان نەچێت "بەر لە هەر شتێك باوەڕ"، هەرچییەك هەیە لە دوای ئەوەوە دێت.

بە دەم وتنی: "بۆ جارێکی تر" پۆلەکەم بەجێ هێشت، بەڵام چەند زەحمەتە بتوانی لە وانەیەکی یەك کاژێریدا بەجێی بگەیەنیت. دەمزانی هەر یەکە و زیاد لە پرسیارێکی دەبێت.



## بەر لە هەر شتێك باوەڕ

ئیمانە ئینسان دەکات بە ئینسان.

هەروەك پێشبینیم کرد، پاش ئەوەی وانەکەی ڕابردوومان بە "بەر لە هەر شتێك باوەڕ" کۆتایی پێهێنا، وا ئێستا هەریەکە و بارێك پرسیاری لەگەڵ خۆیدا هێناوە. تەنانەت لە ڕۆژانی پێشتردا لە نێوان خۆیاندا قسەیان لە بارەوە کردبوو و لە گەورەکانیان پرسیبوو.

پێشی هەموویان فەیلەسوف قسەی کرد، چونکە پرسیارەکەی ئەو زۆر گرنگ بوو و دەربارەی (بنەماکانی باوەڕ) بوو.

محەمەدی فەیلەسووف بە شڵەژانێکی زۆرەوە وتی:

- مامۆستا! تۆ وتت هەر پرسیارێکتان لەسەر باوەڕ هەبوو، ئامادەی بکەن و لە منی بپرسن، بەڵام من نەمتوانی باش خۆم ئامادە بکەم، چونکە کە ئەمەم لەماڵەوە باس کرد، یەکسەر دایە گەورەم قسەی پێبڕیم و وتی: "کوڕی خۆم! هەرگیز نەکەی ئەم پرسیارە پڕ لە گومانانە لەسەر مەسەلەی باوەڕ، بە مێشکتدا بێنی و بیری لێبکەیتەوە". هەروەها وتی:"بە هیچ جۆرێك ها، کوڕی خۆم! مرۆڤ بە بیرکردنەوە لەمانە لە دین دەردەچێ، خودا پەنامان بدا...". منیش زۆر ترسام، وتم لە جیاتی ئەوەی چاکتر باوەڕ بێنم، با لە باوەڕیش نەچمە دەرەوە، بۆیە پرسیاری زۆرم ئامادە نەکرد. ڕاستییەکەی هەوڵم دا هیچ بیری لێنەکەمەوە، بەڵام نەمتوانی. بۆیە هێشتاش پرسیارم هەیە. ئەمانەم بەبیردا هات، ئەگەر چی حەزیشم نەدەکرد...

سێ چوار کەسی تریش دەستیان بەرز کردەوە و محەمەدیان بە ڕاست دەخستەوە. ئەوانیش لە ماڵەوە هەمان شتیان پێوترابوو. تەنانەت باوکی یەکێکیان بڕیاری دابوو، بێتە لام و لەو بارەیەوە

قسەم لەگەڵدا بکات، کە چۆن مامۆستای ئایینم و پرسیارم لە بارەی هەبوون و تاك و تەنهایی خودا، لەو منداڵانە کردووە...

ئەوە ڕوون بووبووەوە کە پێویستە لە کوێوە دەست پێبکەین.

وتم:

– باشە، با سەرەتا لەوە بدوێین ئایا من بیر کردنەوە و پرسیار کردنتان لێقەدەغە بکەم؟ من هەر قسە بکەم و ئێوەش ئەوەی دەیبیستن وەك خۆی وەریبگرن، نە بیر بکەنەوە و نە بپرسن... قبووڵە؟ ئەوەتان دەوێ؟

بێگومان ئەمە بە زۆرینە و زۆریش بەتوندی ڕەت کرایەوە. ئەوان وتیان ئێمە گەرەکمانە تێبگەین، بۆیە قسە دەکەین، بیر دەکەینەوە و دەپرسین. باوەڕەکەمان دەسەلمێنین، بەو واتایەی بەهێز و تۆکمەی دەکەین. ئەگەر وا بکەین، لە کاتی ڕووبەڕوو بوونەوەی پرسیاری بێباوەڕان نابەزین. ئەگەر نا، قسەی کەسێکی بێباوەڕ، مێشکمان تێك دەدات و باوەڕمان لەق دەکات. ڕەنگە هەر کەس نەبێت، بۆی هەیە کتێبێك، ڕۆژنامەیەك یان فیلمێك بێت. کەواتە پێویستە هەمیشە لە ئامادەباشیدا بین بۆ پارێزگاری کردن لە بیروباوەڕمان...

یەکسەر یەکێکی تر داوای مۆڵەتی قسەی کرد.

وتم:

– بلێ، ڕۆڵە!

- باشه، مامۆستا! بۆچی گەورەکانمان بیر لەوانە ناکەنەوە کە باسیان دەکەیت؟ ئەوەتا دایکی منیش حەز ناکات زۆر خۆم بە بابەتە ئایینییەکانەوە سەرقاڵ بکەم، جا پرسیارکردن هەر هیچ! خۆ ناشێ نیازیان خراپ بێ؟! ئەی تۆ بڵێی لەبەرچییان بێ؟!

- بێگومان لە پشت ئەم ڕەفتارەیانەوە مەبەستێك هەیە، بەڵام بۆ ئەوەی باسەکەمان زۆر پەرش و بڵاو نەبێتەوە، بە چەند خاڵێك باسی دەکەین:

یەکەمیان پەیوەندیی بە ڕابردووەوە هەیە. پێشان، گومان لەسەر مەسەلەکانی پەیوەست بە باوەڕ، گەلێك کەم بوو. هەموو کەسێك زۆر بەتوندی دەستی بە باوەڕەوە گرتبوو. چاو کەوتن بە کەسێك کە باوەڕی (بەتایبەتی بە خودا) نەبێ، وەك مەحاڵ وا بوو. چونکە لەناو کۆمەڵێکی وا باوەڕداردا، ئەگەر کەسێکی وەها هەشبووبێ، زۆر خۆی ئاشکرا نەکردووە. لە کۆمەڵێکی وادا هەست نەکردن بە پێویستیی بیری قووڵ و سەلماندن، شتێکی ئاسایی بووە.

بەڵام ئایا لە ڕۆژگاری ئەمڕۆماندا، بارودۆخەکە هەر وایە؟ ئەمڕۆ لە هەموو گەڕەکێکدا و بگرە لە هەموو کۆڵانێکیشدا زۆر بەئاسانی چاوت بە (هەر هیچ نەبێ) کەسێکی بێباوەڕ یان باوەڕ لاواز دەکەوێت. کەواتە بەپێچەوانەی ڕابردووەوە، ئێستا پێویستە لە تواناتدا بێت باوەڕەکەت بپارێزیت و بەرگریی لێبکەیت و بیسەلمێنیت.

کە قسەکانم بەمە گەیشت، محەمەدی فەیلەسووف هەڵیدایێ:

– زۆر ڕاستە، مامۆستا! ئێستا تەنانەت لە پۆلەکەی ئێمەشدا کەسانێك هەن خاوەن باوەڕ نین.

وتم:



– نەخێر، فەیلەسووف! ڕەنگە لە پۆلەکەماندا کەسانێك هەبن بیانەوێت باوەڕەکەیان بسەلمێنن و زانیاریی لەبارەوە پەیدا بکەن، نەك بێباوەڕ بن. بێباوەڕی شتێکە و هەوڵدان بۆ باوەڕ هێنان شتێکی ترە. چەند جێگەی داخە، لە کۆمەڵگەی ئێمەدا ئەوانەی هەوڵ دەدەن باوەڕ بێنن و لەدەست بێباوەڕی ڕزگاریان ببێت، بە چاوی بێباوەڕ لێیان دەڕوانرێت. ئەمە لە کاتێکدا کە ئەوان کەسانێکن لەو بارودۆخەی تێیدان ڕازی نین و لە هەوڵدان باوەڕ بێنن و ببنە خاوەن باوەڕێکی تۆکمەتر لەوەی هەیانە.

چاودێری پۆل کەمێك قەڵس دیار بوو، بە دەم چاو بڕینە محەمەدی فەیلەسووفەوە وتی:

– مامۆستا! باسی ئەوەتان دەکرد کە بۆچی پیرەکان حەز بە پرسیاری تایبەت بە باوەڕ ناکەن، محەمەد بەڕەیەکی تری خستە مزگەوتەوە.

– بەڵێ، با ئەوەشتان بۆ باس بکەم. ئازیزەکانم! لەبەر ئەوەی جاران هێندە ئاتاج بە زانیاریی سەلمێنەر نەبووە لە بارەی باوەڕەوە، بۆیە دەبینی بە شێوەیەکی وا لە بارەیەوە نەنووسراوە، تا دابەزێنرێتە ناو خەڵکەوە، هەر ئەوەندەیە بە شێوەیەکی زانستییانە لە کتێبەکاندا جێی کراوەتەوە. لە دەورانی گەورەکانماندا، وانەی ئایین نەبووە و زانیاریی ئاینی بە شێوەیەکی ڕێکوپێک بڵاو نەکراوەتەوە. هەر ئەوانە خۆیان لە باسی باوەڕ داوە کە ویستوویانە هێرش بکەنە سەر باوەڕ و بیشێوێنن، بۆ ئەمەش هەڵساون زانیاریی پڕ لە هەڵەیان خستووەتە سەر کاغەز.

گەورەکانیشمان کە لەم هەلومەرجەدا گەورە بوونە، حەزیان نەکردووە گوێیان لەو پرسیارانە بێت کە پەیوەندییان بە باوەڕەوە هەیە، چونکە لەبەر بێتفاقییان نەیانتوانیوە وەکو پێویست وەڵامیان بدەنەوە. بۆیە وەك ئەوەی لە باوك و باپیریان بینیویانە، درێژەیان بە باوەڕیان داوە، بێئەوەی بتوانن بیسەلمێنن و بەڵگەی لەسەر بێننەوە.

دەترسن، چونکە پێیان وایە دوور نییە ڕووبەڕووی پرسیارگەلێك ببنەوە، وەڵامەکەیان لا نەبێ و بەم جۆرەش باوەڕیان لەق ببێ... کەواتە کاتێك پێتان دەڵێن بیر لە باوەڕ مەکەنەوە و پرسیاری لە بارەوە مەکەن، ناڵێن باوەڕ مەهێنن، بەڵکو دەڵێن باوەڕ بێنن. دەیانەوێت بڵێن باوەڕ بێنن ئەگەر لێیشی تێنەگەن و هیچیشی لە بارەوە نەزانن.

بەڵام ئەمە بۆ ئەم ڕۆژگارە ناخوا... چونکە ئەم سەدەیە سەدەی زانست و زانینە. ئێستا تەنانەت منداڵانیش حەز دەکەن زانیاری لە بارەی ئەوەوە پەیدا بکەن کە باوەڕی پێدێنن. ئەمە جگە لەوەی کە ئێستا دەکەوینە بەر کاریگەریی ئایین و بیروباوەڕی ترەوە. هۆکارەکانی ڕاگەیاندنی وەك ڕۆژنامە، گۆڤار، کتێب، تەلەفزیۆن...هتد کەلتوور و بیروباوەڕەکان لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر دەگوازنەوە. زەوی بچووك بووەتەوە و وای لێهاتووە هەموو کەسێك لە هەموو شتێك بەئاگایە. چیی دی باوەڕی بێ زانیاری لە بەردەم ئەو هەموو فشارە خۆی بۆ ناگیرێ. دەبێ بە زانیاری و ڕۆشنبیریی باوەڕمان بسەلمێنین و بە ئەقڵمان ڕاستییمان بۆ دەربکەوێت.

وێڕای هەموو ئەمانە، ئەو متمانەیەی جارانیش نەماوە. جاران کە کەسێکی گەورە قسەیەکی دەکرد، بە هۆی کەسایەتییەکەیەوە

متمانە و باوەڕی پێدەکرا، بەڵام ئەمڕۆ متمانە لە ڕەگەوە جێی لەق بووە، وای لێهاتووە کەس باوەڕی بە کەس نەماوە. بۆیە دەبێت تەنانەت ئەوەی دەربارەی باوەڕیش دەیڵێیت، بتوانی بیسەلمێنیت. ئەگەر بڵێیت پێغەمبەریش (دروودی خودای لێبێت) وای فەرمووە، هەر باوەڕ ناکەن، دەیهێڵنەوە سەر ئەوەی ئەقڵیان قبووڵیەتی یان نا. بە دەستەواژەیەکی تر، هەموو شتێك بە شێوەیەکی «زانستییانە» دەخوازرێ.

گشت مەسەلەکەش هەر ئەمەیە. دیسان هاتینەوە سەر قسەکەی سەرەتامان کە وتمان: "بەر لە هەر شتێك باوەڕ"، بەڵام باوەڕێکی کوێرانە نا، بەڵکو بە شێوەیەکی زانستییانەی سەلمێنراو.

## باوەڕ خۆراکی گیانە

دیسان چاودێری پۆل خۆی پێنەگیرا و هەڵیدایێ:

– مامۆستا ! وا بڕوات، لەم دەرسەش ناتوانین بچینە ناو باسەکەمانەوە. پێم وایە هاوڕێیان بابەتەکەیان باش هەرس کردووە. ئەگەر بچینە سەر مەسەلەی سەلماندنی باوەڕ، چاکتر نییە؟

– ڕاست دەکەیت، با بچینە نێو بابەتەکەمانەوە. بەڵام دەبێ سەرەتا ئێوە بە پرسیار و وەڵامەکانتان لە دەرگای باسەکە بدەن، منیش یارمەتیتان دەدەم.

دەی با بێینە سەر دروشمەکەمان "بەر لە هەر شتێك باوەڕ".

بۆچی بەر لە هەر شتێك باوەڕ؟...

پوختەی پرسیار و وەڵامەکان، کە تێکڕای پۆل تێیدا بەشدار بوون، ئەمە بوو:

"مرۆڤ بوونەوەرێك نییە تەنها لە گۆشت و ئێسك پێکهاتبێت، بەڵکو خاوەنی بونیادێکی مەعنەویشە – کە ڕۆحە. وەك چۆن جەستەمان بۆ زیندوو مانەوەی پێویستی بە نان و ئاوە، ئاواش ڕۆحمان بۆ زیندوو مانەوەی پێویستی بە خۆراکی مەعنەوییە، کە لە سەرووی ئەو خۆراکانەش، باوەڕ دێت. باوەڕ خۆراکی ڕۆحە. ئەگەر ڕۆح و بونیادی ڕۆحیمان بە باوەڕ بەخێو نەکرێن، بالآ ناکەن و کورتەبنە دەردەچن. ڕۆحێکی کورتەبنە و هەڵنەکردوو، لە ئاست جەستەیەکی هەڵکردوو بە چی دەچێت؟ ئەمە وا لە مرۆڤ دەکات لە ترێلەیەك بچێت مەکینەی ماتۆڕی لێبەسترا بێت. لەش قەبە و قورس، ماتۆڕیش بەقەد مێشێك... ئەو ڕۆحەی بە باوەڕ گەشە نەکات، لەناو جەستەیەکدا کە بەردەوام لە گەشە کردندایە، نابەرانبەرییەکی ئاوای لێدێتە ئاراوە.



● وانەی زیندەوەرزانی بوو، لە تاقیگە تاقیکردنەوە ئەنجام دەدرا. بەر لەوەی وانەکە دەست پێبکا، مامۆستا هۆشداریی دایە قوتابییەکان:

- قوتابییە ئازیزەکان! ئەم کەلوپەلانەی تاقیگە لە ئەنجامی هەوڵ و تەقەللا و دەستڕەنگینییەوە هاتوونەتە دروست کردن، وریا بن زیانیان پێنەگەیەنن.

یەك لە قوتابییەکان پرسی:

- مامۆستا! کەسانی دەستڕەنگین ئەم ئێسکەپەیکەرەیان دروست کردووە، ئەی کێ ئێسکەپەیکەری ئێمەی دروست کردووە؟

ئەی بۆ کۆمەڵگە چی؟... مەگەر خەڵکی بۆ ئەوەی بتوانن پێکەوە بژین، پێویستیان بە باوەڕ نییە؟

ئەم پرسیارەش دوای ئەوەی وەڵامی پێویست درایەوە، بەم جۆرە پوخت کرایەوە:

"بۆ کۆمەڵگەش باوەڕ پێویستە، بەتایبەتی باوەڕ بە خودا... لە کۆمەڵگەیەکی بێباوەڕدا چۆن ئاسایش و ئاسوودەیی دەستەبەر دەبێ؟ کەی کەسانێك باوەڕیان بە خودا نەبێ، دەتوانن پێکەوە دۆستانە بژین؟ بە ترسان لە خودا نەبێت، چۆن دەتوانین دەربەستی خراپەکاری بێین؟"

# مەرجی بوون بە موسوڵمان

بەڵگەیەکی تریش ئەوەیە کە باوەڕ مەسەلەیەکی ئەوەندە گرنگ و بنەڕەتییە، یەکەم پایەیە لە پایەکانی ئیسلام. لەنێو شەش پایەکەی باوەڕ، باوەڕ بوون بە خودا و پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێت) هەیە. نەك هەر ئەوە، بەڵکو چووەتە نێو پێنج پایەکەی ئیسلامیشەوە و سەرەی یەکەمیشی گرتووە.

- کوا بزانم پێنج پایەکەی ئیسلامم بۆ بژمێرن...

- یەکەم شایەتومانە....

- شایەتومان یانی چی؟

- شایەتومان واتە باوەڕهێنان بەوەی جگە لە خودا هیچ خوداوەندێك نییە و پێغەمبەریشمان موحەممەد (دروودی خودای لێبێت) بەندە و نێردەی ئەوە.

- سەیر بکەن، ئەمە یەکەم پایەی ئیسلامە، لە هەمان کاتدا لە نێو پایەکانی باوەڕیشدا هەر هەیە. ئەم پایەی یەکەمە ئەوەندە گرنگە، کەسێك باوەڕی پێی نەبێت و بە زمان نەیڵێت، بە موسوڵمان دانانرێت. کەواتە نە نوێژی، نە ڕۆژووی، نە زەکاتی و نە حەجیشی قبووڵە. بە دەستەواژەیەکی دی، بەر لە هێنانە جێی پایەکانی دیکەی ئیسلام، دەبێ ئەم پایەی یەکەمە بەجێ هێنرابێت.

که قسه گەیشتە سەر ئەمە، پرسیم:

- کێ مەرجی موسوڵمان بوونمان پێدەڵێت؟

هەموویان وەڵامی پرسیارەکەیان بۆ ڕوون بوویووەوە. ئەگەرچی هەندێکیان وتیان سوننەت (خەتەنە) کران، بەڵام دواتر ئەوانیش بۆیان ڕوون بووەوە کە بۆ موسوڵمان بوون پێویستە شایەتومان بهێنرێت. مەرجی پێویست بۆ موسوڵمان بوون، ئا ئەمەیە. ئەوەی شایەتومان دێنێت، وەك ئەوە وایە دووبارە گەڕابێتەوە ژیان، لە سەرجەم گوناهەکانی ڕابردووی دەبەخشرێت و دەچێتە خانەی ئیسلامەوە.

هەر وەك قەید بوون لە قوتابخانە... ئەها دێن قەید دەبن و ناوتان لە تۆمارنامەی قوتابخانەدا تۆمار دەکرێت، ژمارەی ڕیزبەندی وەرژدەگرن و دەبنە قوتابیی ژمارە ئەوەندەی فلان قوتابخانە. ڕێك وەك ئەمە، ئەوەی شایەتومان دێنێ و باوەڕ بە ناوەڕۆکەکەی دێنێ، واتە لە موسوڵمانێتی قەید بووە. بۆ لەوەودوا، وەك چۆن قوتابی ناچارە دەوام بکات، بێتە دەرسەوە و بخوێنێ، ئەمیش لەسەریەتی دەست بداتە پەرستشەکانی. ئایا ئەوەی ناوی لە قوتابخانەدا تۆمار نەکرابێت، ئەگەر لە گشت وانەکانیش دەربچێت، کارتی دەرچوونی دەدرێتێ؟ واز لە کارت بێنە، چما دەیەڵن بێتە دەرسیشەوە؟ با بڵێین خۆی خزاندووەتە جەنجاڵییەکەوە و چووەتە دەرسەوە، بگرە با

نمرەشی وەرگرتبێ، بە تۆمار کرانێکی ساختە و گزیکارانەوە، نە کارتی دەدرێتێ، نە بە دەرچوو دادەنرێ و نە دەشبرێتە پۆلێکی ترەوە.

وەك ئەوەی ئەم نموونەیە، هەر کەسێك ئەم شایەتومانە، کە یەکەم مەرجی موسوڵمان بوونە، نەهێنێت و باوەڕی بە ناوەڕۆکەکەی نەبێت، ئەگەر هەموو پەرستشەکانیش ئەنجام بدات و پایەکانی دیکەی ئیسلامیش بەجێ بهێنێت، هەر بە موسوڵمان دانانرێت، حسێبیش بۆ پەرستشەکانی ناکرێت، دەبێ سەرەتا باوەڕ بێنێت. کەواتە: "بەر لە هەر شتێك باوەڕ"...

بەو مەرجەش کە لە ژێر فشاردا نەبێت و زۆری لێنەکرابێت. خۆ ئەگەر لە ژێر چاو لێ سووورکردنەوە و ترساندن و زۆر لێکردن شایەتومانی پێبهێنرێت، بە باوەڕدار دانانرێت. باوەڕ بە دڵ و دڵخوازانەیە.

## لاله حەسەن و دراوسێ ئەرمەنییەکەی

ئاشـکرایە هــەموو موسـولّمانێك حــەز دەکـات کەسـانی تـریش شایەتومان بێنن و موسوڵمان ببن، بەمەش هەست بە خۆشییەکی لـە ڕادده بـەدەر دەکـات. لالـە (خـالّۆ) حەسـەنیش وەهـا موسـولّمانێك بوو...

گشت خەڵکی دێکە ئەویان بە کەسی نزیکی خۆیان دادەنـا. لەبـەر شیرین خوویی و دڵسافییەکەی، هـەموو کەسێك خۆشـی دەویسـت و ڕێزی لێدەنا. تەنانـەت ئەرمەنییـەکانیش، کـە ئـەو دەمانـە لـەو دێیـە هــەبوون، هــەمان هەسـتیان بەرانبــەری هــەبوو... لالــە حەســەن، دراوسێکەی کە ناوی (هرلاکیان) بـوو، زۆر خـۆش دەویسـت و هـەموو جارێك پێی دەوت:

- کـوڕە هرلاکیـان! هـەموو دراوسـێکان لێـت ڕازیـن و، تـا ئێسـتا خراپەیەکمان لێ نەبینیوی، بەس موسوڵمان ببیت، یەکسـەر دەچـیتە بەهەشتەوە. دە شایەتومان بێنە و هەر دوو دونیات ببەوە...

ئەویش هەموو جارێك بەپێکەنینەوە گوێی لە لاله حەسەن دەگـرت و دەیوت:

- لالـە! منـیش حـەزم لـە موسـوڵمانێتی هەیـە. پەلـەم لێمەکـە، ویستی خودای لەسەر بێ، ڕۆژێك موسوڵمان دەبم.

لاله حەسەن هەموو جارێك ئەوەندەی دی لەسەری سوور دەبوو:

– ویستی خودای لەسەر بێت یەعنی چی؟! خودا ویستوویەتی و ئیسلامی کردووەتە دوا ئایین. بیانووی بێ بنەما مەدۆزەرەوە و نازمان بەسەردا مەکە...



کات هات و چوو، ساڵ بەدوای ساڵدا هات و لاله حەسەن و هرلاکیانی هاوسێی بەساڵدا چوون...

ڕۆژێك مانایان بۆ لاله حەسەن هێنا و وتیان:

– لاله حەسەن! لاله حەسەن! زوو بگە، هرلاکیان حاڵی تێکچووە و داوای تۆ دەکا.

لاله حەسەن بە ڕاکردن خۆی گەیاندە لای، بینی وا لەسەر جێ کەوتووە و لە ڕۆح دانە. بەڵام هرلاکیان بەو حاڵەشیەوە، هێزی دایە بەر خۆی و ئیشارەتی بۆ لاله حەسەن کرد لێی نزیك ببێتەوە، بە دەنگێکەوە کە هەر ئەوەتا لێی دەردەچوو، وتی:

– لاله حەسەن! ئەوەی ساڵەهای ساڵە لێمی داوا دەکەیت، ئێستا دەمەوێ بیڵێم، بڕیارم داوە موسوڵمان ببم.

هەناسەکانی کۆ کردەوە و دەستی کرد بە شایەتومان هێنان، دوور نەبوو ئەمە دوا قسەی بێت لە ژیاندا.

– هەی هەی! ئەوە چییە؟

لالە حەسەن دەستی دایە خاولییەك و لە دەمی پەستی و وتی:

– ڕاوەستە بزانم! هەر وا بەئاسانی؟! چەند ساڵە شایەتومانت نەهێناوە، ئێستا دەتەوێ لە دوا هەناسەی ژیانتدا بیهێنی و بێ ئەوەی هیچ پەرستشێك بکەیت، بچیتە بەهەشتەوە. مادام ئەوەندە ساڵە لێت پاڕامەوە نەتوت، ئێستاش من نایەڵم بیڵێیت!

## لالە حەسەن چاکی کرد یان خراپ؟

شەپۆلێکی کورتی خەندە پۆلەکەی گرتەوە، وتم:

– ڕۆڵەکانم! لالە حەسەن چاکی کرد یان خراپ؟

دیسان لە نێوان ئەوانەی وتیان چاکی کردووە و ئەوانەی ڕای پێچەوانەیان هەبوو، کورتە دەمەقاڵەیەك و دواتریش دەنگدان هاتە ئاراوە. ڕێژەی ئەوانەی ڕەفتارەکەی لالە حەسەنیان لا پەسەند نەبوو، لە سەدا نەوەت و پێنج بوو...

بەڵام (ثۆیا) نەیتوانیبوو بەسەر کەللەڕەقییەکەیدا زاڵ ببێت، هەڵسایە سەر پێ و بە کەمێك ئۆقرە لێ هەڵگیراوییەوە پرسی:

– تو خودا مامۆستا! ئەوە دادگەرانەیە کەسێك هیچ پەرستشێك نەکات، بەس شایەتومان بێنێ، بڕواتە بەهەشت؟

– جا بۆ دادگەرانە نەبێت؟

– چونکە مامۆستا، تەنانەت ئەوەش کە بە موسوڵمانی لەدایك دەبێ و هەر بە موسوڵمانی گەورە دەبێ و هەموو پایەکانی ئیسلامیش بەجێ دەهێنێ، هێشتا گەرەنتیی ئەوەی نییە چاکەکانی قورستر بێ و بچێتە بەهەشتەوە، کەچی لەولاوە فەلەیەك شایەتومان بێنێ و بێ هیچ پەرسشێك بچێتە بەهەشت، چۆن دەبێ؟!...

– دەبێ، بۆ نابێ؟! چونکە شایەتومان ئەگەر لە دوا سات و هەناسەشدا بوترێت، هەر شتێکی بێ بایەخ و کەم نییە. ئەی لە وانەی پێشوومان‌دا نەمانوت: "بەر لە هەر شتێك باوەڕ"؟... ئەمە ئەو کلیلەیە کە هەموو شتێك دەکاتەوە. ئەمە نەبێ، مانای وایە هەزاران دەرگای داخراو لە ڕێماندا هەیە.



بێ لەوەش، ئەوەی لە دوا ساتیشدا بێت باوەڕ بێنێ، مانای وایە لە ژیانیدا بە شێوەیەك ژیاوە لەبار بووە بۆ باوەڕ هێنان و، بەر لە شایەتومانەکەش لە بارێکدا بووە ڕووی لە باوەڕ بووە، یان بلێین هەر هیچ نەبێ بە دەوری «شایەتومان»دا خولاوەتەوە، بەڵام نەچووەتە ناوییەوە. مەبەستمە بڵێم : شایەتومان هەر وا بەئاسانی لە دوا ساتدا نایاتە سەر زمان، بەڵکو پێشینەی هەیە...

محەمەدی فەیلەسووف خۆی تێهەڵقورتاند:

– کەواتە مامۆستا، کابرا لە ئیسلامی کۆڵیوەتەوە و شتێکی لێزانیوە. تەنها بۆ ئەوە شایەتومانی نەهێناوە، تا پەرستشەکانی لەکۆڵ ببێتەوە. ئەگەر مەبەستی بێت لە دوا هەناسەدا بیڵێ و بەئاسانی ڕزگاری ببێت چی؟!...

– محەمەد! بیرت بەردەوام لای فێڵ و گزیکاری نەبێت. کەسێك وا بیر بکاتەوە، ئەگەر لە دوا هەناسەشدا باوەڕ بێنێ، هەر بەتەواوی لە بەرپرسیارێتییەکانی سەرشانی ڕزگاری نابێت. خودا بەوانەش دەزانێ کە لە قووڵایی دڵاندا شارراونەتەوە...

***

ئەو قوتابییانەی لە دواوە دانیشتبوون و فسکە فسکیان بوو، کەمێك چاوم لێسوور کردنەوە و هەڵمساندنە سەر پێ و وتم:

– ئەوە باسی چیتان دەکرد؟

– مامۆستا! باسی مەسەلەکەی لالە حەسەنمان دەکرد.

– چۆن؟

– مامۆستا! چونکە جەنابت ڕای خۆت لە بارەیەوە دەرنەبڕی.

یەکسەر قوتابییەکان وەك کۆرس هاواریان کرد: "لالە حەسەن ناهەقە، کەی ئەم ڕەفتارە هەقە؟"

– باشە! هۆی چییە موسوڵمانێکی دڵپاکی وەك لالە حەسەن هەڵەیەکی وا دەکات؟ ناکا حەزی لە گوناهکاری بێت؟

ماوەیەك دەنگیان لێبڕا، زوو بێدەنگییەکەم نەهێشت:

– ئازیزەکانم! هەندێ جار هەر دڵپاکی و نیازپاکی بەس نین، زانین و ڕۆشنبیرییش گەرەکن. کەموکوڕییەکەی لالە حەسەنیش ئا ئەمەیە.

لالە حەسەن وا دەزانێ کارێکی چاکی کردووە کە نەیهێشتووە کابرا شایەتومان بێنێ، پێشی وایە ئەوەی کردوویەتی لەگەڵ ئیسلامدا یەك دەگرێتەوە. بەڵام ئەمە بە هیچ شێوەیەك ڕاست نییە. بە دیدی ئیسلام، مرۆڤ کەی بیەوێت باوەڕ دێنێ، کەسیش ناتوانێت ڕێگریی لێبکات.

محەمەدی فەیلەسووف وتی:

– ڕەنگە لالە حەسەن هەر لەبەر نەزانیی نەبووبێت، دوور نییە کەمێك لەبەر ئێرەیی (حەسوودی)شی بووبێ.

– بە چی دەزانی؟

– مامۆستا! کەمێك لەمەوبەر ئۆیای هاوڕێشمان هەر وای وت، کە باوەڕ هێنانی ئاوا کەسێك لە دوا ساتدا نادادییە بەرانبەر موسوڵمانە ئەسڵەکان. دوور نییە لالە حەسەنیش وەك ئۆیا بیری کردبێتەوە و ئێرەییی پێبردبێت...

ڕێم لە وەڵام دانەوەی توندی ئۆیا گرت و گوتم:

– محەمەد! ئۆیا ئێرەیی نابات، چونکە ئەو هەر لە ئێستاوە موسوڵمانێکی باشی خاوەن هۆش و بیرە. هەر لەو ڕێیەشدا دەیەوێ

زیاتر ڕەو بکات و بەرەو پێش بچێ، بۆیە ڕێی تێناچێ خوویکی ناساز لەگەڵ موسوڵمانێتیی وەك ئێرەیی، لە خۆیدا جێ بکاتەوە. ئەم وەڵامە لە جیاتی ئەو دەدەمەوە.

بەڵام فەیلەسووفەکەمان هێشتا هەر بەپێکەنینەوە لە ئۆیای دەڕوانی، وەك ئەوەی بڵێ: "پێت چۆن بوو؟". بەزەحمەت توانیمان قەناعەت بە ئۆیا بێنین وەڵام نەداتەوە.

– نە کاتی دەمەقاڵەیە نە شوێن! بۆیە با بگەڕێینەوە سەر باسەکەمان. کەواتە لالە حەسەن لەبەر نەزانی ئەو هەڵەیەی کردووە. ئەگەر شارەزا بووایە و ئاگاداری هەندێ ڕووداو بووایە کە لە سەردەمی پێغەمبەرمان (درووودی خودای لێبێت) دا ڕوویان داوە، نەدەبووە ڕێگر لە بەردەم باوەڕهێنانی هرلاکیاندا. ئەو ڕووداوانە کە لە مێژووی ئیسلامدا ڕوویان داوە، نموونەگەلێکی زیندوون. ئەوەتان لەسەر دەکەمە ئەرکی ماڵەوە. دەبێ بچن لێی بکۆڵنەوە و دواتر لە پۆلدا باسی بکەن. ئەمە بەتایبەتی ئەرکی سەر شانی فەیلەسووف و ئۆیایە... نموونەی ئەو ڕووداوانەی دەستیان دەکەوێ، دەبێ لە پۆلدا بیگێڕنەوە.

## ڕێگەی موسوڵمان بوون



– با نموونەیەکتان بۆ بێنمەوە لەسەر ئەوەی چۆن نەفامی دەبێتە هۆی ئەنجام دانی هەڵە و وا لە مرۆڤ دەکات ببێتە جێی پێکەنین.

هەر وەك دەزانن دەوڵەتی عوسمانی، لە ساڵانی دواییدا، لە زۆر ڕووەوە تا بڵێی لاواز بووبوو، ئێ خۆ ئەگەر لاواز نەبووایە کۆتایی پێنەدەهات و، زیاتر دەمایەوە.

لە سەرووی ئەو شتانەی ڕووی لە کزی و لاوازی کردبوو، زانین و ڕۆشنبیری بوو. دەوڵەت لەو زانینە قووڵەی سەرەتاکانی و ئەو بیروباوەڕە ڕیشەدارەی لە زانستەوە سەرچاوەی گرتبوو، دابڕابوو و دوورکەوتبووەوە. بە دوور کەوتنەوەشی داڕووخا و هەرەسی هێنا.

لە یەکێك لەو ساڵانەی دەوڵەت بەخێرایی بەرەو هەرەس دەچوو، (یەنیچەری)یەك هەموو جارێك قینی لە دراوسێ جوولەکەکەی هەڵدەستا و دەیوت:

– ئەم جووە حاڵی زۆر لە ئێمەومانان باشترە، لە تێر دەخوا و دەخەوێ. لە خێر و بێری ئەم وڵاتە دەخوات، کەچی ڕۆژێك لە ڕۆژان ئەوەی هەر بە خەیاڵیشدا نایەت موسوڵمان ببێ. ئەمە چ نانمەکییەکە؟ ئای ڕۆژێك هەلێکم بۆ هەڵکەوتایە و حیسابی ئەو بێنمەکییەم لەگەڵ بکردایە!

یەنیچەرییەکە سەیری کرد بۆی ڕێك ناکەوێ، لە دڵی خۆیدا وتی: "چاکتر وایە خۆم هەلێك بڕەخسێنم". ئەوە بوو لە کۆڵانێکی چۆڵدا چاوی بە کابرای جوولەکە کەوت، کێشای پێیدا و دای بە زەویدا، پێی نایە سەر سینگی و شمشێرەکەی لێ هەڵکێشا و وتی:

– کوڕە هەی جوو! ئای چەند بە دەستتەوە دەناڵێنم!

کابرای جوولەکەش لەبەر ئەوەی زۆر دڵی بە دونیاوە بوو، لە ترسی مردن چاوەکانی ئەبڵەق بووبوون:

– بە قوربانت بم، چی دەڵێی دەیکەم، بەس تووڕە مەبە و گیانم ببەخشە.

یەنیچەرییەکە لە خۆشیی ئەم قسانە شاگەشکە بووبوو:

– دە یەڵڵا، ئەگەر ڕاست دەکەی ببە بە موسوڵمان!

جوولەکەکە هیچ نیازێکی وای نەبوو ببێت بە موسوڵمان، بەڵام لە ترسی مردن وتی:

– قوربان! ئەمر کە، چی بڵێم تا موسوڵمان ببم؟

به ڕای ئێوه وەڵامی یەنیچەرییەکە چی بوو بێت باشە؟ وتی:

– ئاخ لە دەستت، وەڵلا منیش نازانم!

سەیری پۆلەکەم کرد، بەقەد ئەوانەی کە پێدەکەنین، کەسانێك هەبوون لە نەفامیی یەنیچەرییەکە واقیان وڕمابوو، بەتایبەتی فەیلەسووفەکەمان بەم جۆرە خەمباریی خۆی دەردەبڕی:

– ئاخ! چۆن ئەو هەلەی لەدەست داوە، ئای ئەگەر من دەبووم...

قسەم پێی بڕی:

– بەڵام ئایا بەزۆر کردنە موسوڵمان لە ئاینی ئێمەدا هەیە؟

تاکە ڕێگای کردنە موسوڵمان ئەوەیە وا لە بەرانبەرەکەت بکەیت ئاواتەخواز بێت بێتە ناو ئەم ئایینەوە و بە دڵ و مێشك قەناعەتی پێ بێنیت. بە هیچ جۆرێك زۆر لێکردن لە ئیسلامدا جێی نابێتەوە. هەر کێیەك بێت، ناتوانی بەزۆر بیکەیتە موسوڵمان. چونکە هەندێ جار زۆر لێکردن، کاردانەوەی پێچەوانەی لێدەکەوێتەوە، بۆی هەیە کەسەکە بکەوێتە حاڵێکی خراپترەوە.

با بیر لە کەسێکی بێباوەڕ بکەینەوە. لە خراپترین باردا دەتوانین ناوی (کافر)ی لێ بنێین، بەڵام ئەگەر زۆرمان لێکرد و هەوڵمان دا لە ژێر گوشاردا بیکەینە موسوڵمان، کابرا نەك باوەڕی هێناوە، بەڵکو کەوتووەتە بارێکی خراپترەوە، بەوەی بووە بە (مونافیق). مونافیق دوو ڕووی هەیە، لە کاتێکدا لە دەرەوە وا دەردەکەوێ باوەڕی

هێناوه، بەڵام لە ناوەوه باوەڕی نەهێناوه. بەپێی بیروباوەڕی ئێمەش «مونافیق» لە «کافر» خراپترە، چونکە لە باوەڕیدا ڕاستگۆ نییە. لەبەر ئەوەش کە دوو ڕووی هەیە هەڵخەڵەتێنەرە.

بیرتانە کەمێك لەمەوبەر وتم هەر نیازپاکی بەس نییە؟ "من دڵم پاکە و نیازم باشە، هێز بەکاردێنم بۆ ئەوەی کەسێك بکەمە موسوڵمان..." ئەمە زۆر هەڵەیە، (خراپەکاریی بە نییەتی پاکەوه) دەگەیەنێت، چونکە ئەمە دەبێتە هۆی ئەوەی کەسێکی (بێباوەڕ) بکەیتە (دوو ڕوو) نەك (موسوڵمان).

ئینجا پێم بڵێن، بۆ مرۆڤ پەنا دەباتە بەر فشار خستنە سەر بەرانبەر تا وای لێبکات بیروباوەڕ و بۆچوونەکانی قبووڵ بکات؟



• ناکرێ لە باوەڕدا زۆر لە کەس بکرێ. دەبێ قەناعەت بە مێشك و دڵی خەڵکی بهێنرێت.

– لەبەر ئەوەی ناتوانێ بە ڕاڤەکردن، بیروباوەڕەکەی بە بەرانبەرەکەی بداتە قبووڵ کردن.

– چونکە متمانەی بە زانستەکەی نییە...

– چونکە ناتوانێ باوەڕەکەی بۆ بەرانبەرەکەی بسەلمێنێت...

خەریك بوو وەڵامەکان درێژە بکێشن، پێم بڕین:

– ئافــەرین بــۆ ئێــوە. زۆر جــوان بیردەکەنــەوە. کەواتــە ئایــا موسوڵمانی زانا و ڕۆشنبیر و خاوەن هەست، گوشار بەکار دەهێنێ بۆ ئەوەی باوەڕەکەی بە بەرانبەرەکەی بداتە قبووڵ کردن؟ دەست بۆ تفەنگ و تێلا دەبات؟

کەواتە گشت ئەمانە لە متمانە نەبوون بە باوەڕەکە و هەست کردن بە کەمی ڕۆشنبیرییەوە سەرچاوە دەگرن. بۆیە دەبێ ئێوە هەوڵ بدەن شارەزایی لە بارەی بیروباوەڕەکەتانەوە بەدەست بێنن، تا ئەم هەڵانە ئەنجام نەدەن و بە جۆرێك موسوڵمانێتی بۆ خەڵکی ڕوون بکەنەوە لە کەسی مەدەنی بوەشێتەوە. هەر بۆیە زۆر بەدرێژی لەسەر هەندێ بابەت (بەتایبەت) باوەڕ دەڕۆین، تا سەرتاپای شی بکەینەوە.

دیسان وانەکەمان بەکۆتا هات، بەڵام ئەگەر حەز دەکەن بەسەرهاتێکی مێژووییتان بۆ دەگێڕمەوە کە قۆشمەیی نەزانی دەردەخات.

– مامۆستا، بۆمانی باس بکە!

– دە گوێ بگرن...

# سەرەنجامی نەفامی

کەسێکی نەفام، ئەگەرچی خاوەن دڵێکی پاك بوو، بەڵام بە گەنجی زانیاریی ئاینیی بەدەست نەهێنابوو. کە بەساڵداچوو، لەو حاڵەی خۆی گەلێك پەشیمان بوو و دەستی دایە خوێندنی شەرعیی. مەلای مزگەوتێك ڕازی بوو دەرسی پێبلێتەوە. کابرا لە تەمەنی چل ساڵی، ئینجا لە سفرەوە دەستی پێکرد.



هەر لە یەکەم ڕۆژەکاندا، (سوباشی) یەك لێی دەکەوێتە گومانەوە.[1] ئەم غەریبەیەش کە تازە لە گوندەوە هاتبووە شار و هێشتا لە شار ڕانەهاتبوو، دەکەوێتە بەر سەرنجیان و دەیگرن... کە دەهێنرێتە بەردەم سوباشییەکە حاڵی زۆر تێکدەچێت و دەکەوێتە قسەی بێسەروبەر.

---

١- سوباشی لە سەردەم دەوڵەتی عوسمانیدا وەك ئاسایشی ئێستا وابوو. سوباشییەکان بە شاردا دەگەڕان، گومانیان لە هەر کەسێك بکردایە، لێپێچینەوەیان لەگەڵدا دەکرد.

سوباشییەکە هاواری بەسەردا دەکات:

- موسوڵمانیت؟

کابراش لە ترس و حەپەساوی و کەمێکیش بە هۆی بیرکردنەوە لە سەرەنجامی مەسەلەکە، دەڵێ:

- بەڵێ، موسوڵمانم.

- هەر موسوڵمانم و بەس؟! دەبێ بڵێیت: "ئەلحەمدولیللا موسوڵمانم"... ئەی نابێ لە بەرانبەر نیعمەتی موسوڵمانێتیدا، شوکری خودا بکەیت.

بەو قسەیەی ئەوەندەی تر تووڕە دەبێت و لێی دەکەوێتە گومانەوە. کابراش پێی وا نابێت کە ئەمە شتێکی ئەوەندە گرنگ بێت.

- مادام دەڵێیت موسوڵمانم، کەواتە پێم بڵێ پایەکانی ئیسلام چەندن؟

کابرا بە سەرسوڕمانەوە و هەندێکیش لە ژێر کاریگەریی ئەو چیرۆکانەی بیستوویەتی، دەڵێت:

- گەورەم! چلن.

قینی سوباشییەکە دەگاتە ئەوپەڕی و دەڵێت:

– وا دیاره ئەم پیاوە دەیەوێ هەڵمان بخەڵەتێنێ. دەڵێ موسوڵمانم، کەچی ژمارەی پایەکانی ئیسلامیش نازانێ... پاڵی بخەن و تێری بکوتن...

کابرا دەدەن بە زەویدا و شلوکوتی دەکەن. کە هەڵدەستێتە سەرپێ، ناتوانێ لەسەر پێکانی بڕوات. لەناو ئازارێکی بێئاماندا خۆی کۆ دەکاتەوە و خۆی دەگەیەنێتەوە ئەو مزگەوتەی لێی دەخوێند...

کە مامۆستا بەم حاڵە شپرزەیەوە دەیبینێ، لێی دەپرسێ:

– ئەوە بۆ وات لێهاتووە؟

دەکەوێتە گێڕانەوەی بەسەرهاتەکەی و دەڵێ:

– ئاخ، مامۆستا! ژمارەی پایەکانی ئیسلامیان لێپرسیم.

– ئێ دە بتوتایە پێنجن.

کابراش دەڵێ:

– توخودا مامۆستا تۆش...، چۆن بموتایە پێنج؟! من وتم چل ئەوەندەیان تێهەڵدام، خودا نەخواستە بموتایە پێنج هەر دەیانکوشتم!...

## هەر زانین بەس نییە، هێنانەجێ گەرەکە

– بە کەیفی خۆتان پێدەکەن. خۆی هەق وایە سکمان بەو کەسانە بسووتێ کە دەگەنە ئەم تەمەنەی ئێوە و ئەم شتانە نازانن،

نەك پێیان پێبکەنین... ئێوە بەختتان هەیە، کە هەر هیچ نەبێ ئەم بابەتە ساکارانە دەزانن... ئەوەش بزانن هەر زانین بەس نییە، بەڵکو هێنانەجێ و ئەنجام دانی پێویستییەکانی گەرەکە. کەسانێك هەن ئەمانە دەزانن بەڵام بەجێیان ناهێنن، بگرە پێچەوانەکەشی ئەنجام دەدەن. موسوڵمانێکی دەوڵەمەند لە کەسێکی وای پرسی:

– جەناب! پایەکانی ئیسلام چەندن؟

– یەك دانە.

دەوڵەمەندەکە سەری لە وەڵامەکە سوڕما:

– یەکی چی؟! منداڵانیش دەزانن پێنجن.

کابرا هیچ خۆی تێکنەدا، وەڵامێکی وای دایەوە دەنگی لێبڕی:

– سەیرکە، ئێمە خۆمان نوێژ و ڕۆژوومان نەهێشت، ئێوەش زەکات و حەجتان نەهێشت. کە دەڵێم نەمانهێشت یەعنی نایانکەین. ئیدی لە شایەتومان بەولاوە چی مایەوە؟ وایە یان نا؟!

– ئازیزەکانم! با بیرێك لە قسەکانی بکەینەوە، ئایا لە جێی خۆیاندا نین؟ ئایا لە ڕۆژگاری ئەمڕۆماندا موسوڵمانی وا نییە کە شایەتومانیش نازانێت، یان مانگی – ساڵی جارێك بە زوبانیدا دێت؟

– زۆری وا هەیە...

– کەواتە ئەم پایانە کە بەجێ نەهێنرێن، چۆن بە هەبوو دادەنرێن؟ با بیانهێنینەجێ، تا بەچاکی بوونیان دەربکەوێ و لە مێشك و دڵاندا، جێیان قایم ببێ.



- لەسەر شەرەفی دوایین دۆزینەوە زانستییەکانمان!...

● زانین ئەوەیە بەجێ بهێنرێت. زیانەکانی مەی لای هەموو کەسێك ئاشکرایە، بەڵام هەر دەشخورێتەوە.



# ڤیزەی بەهەشت

دوای چەند وانەیەك، محەمەدی فەیلەسووف و ئۆیا وتیان کە چەند نموونەیەکیان لە مێژووی ئیسلامدا دۆزیوەتەوە.

سەرەتا فەیلەسووف کەوتە باس کردن:

– مامۆستا! باوەڕ هەر بەڕاستی گرنگە، چونکە وەك بڵێی ڤیزەی بەهەشتە... بێ بوونی باوەڕ کەس ناچێتە بەهەشتەوە. لە کاتی لێکۆڵینەوەمدا لە فەرموودەکانی پێغەمبەر (دروودی خودای لێبێت) بۆم ڕوون بووەوە کە دەکرێ بێ ئەنجامدانی هیچ پەرستشێك بچیتە بەهەشت.

– بەڵێ، وایە محەمەد! نموونەی چەند ڕووداوێکی وا لە مێژووی ئیسلامدا هەیە. بزانم تۆ کامەیانت دەست کەوتووە. بۆمانی باس بکە کە چۆن دەکرێ بێ نوێژ و ڕۆژوو و هیچ پەرستشێکی دی، مرۆڤ بەهەشتی بێت.

محەمەدی فەیلەسووف یەك دوو جار كۆخی، ڕووی لە قوتابییەكان كرد و لە كەشێكی تا بڵێی شێلگیرانەدا كەوتە باس كردن:

– هاوڕێیان! پێغەمبەرمان (دروودی خودای لێبێت) لە حەوتەم ساڵی كۆچیدا، گەمارۆی قەڵای خەیبەری دا، كە پێگەیەكی بەهێزی ئەو جوولەكانە بوو. لەبەر ئەوەی جوولەكەكان ئازووقەیەكی زۆریان لە خواردن و خواردنەوە هەڵگرتبوو، خۆیان بەدەستەوە نەدەدا. لەو ئان و ساتەدا شوانكارەیەك كە لە دەرەوەی قەڵاكە خەریكی مەڕ لەوەڕاندن دەبێ، داوای دیداری پێغەمبەر (دروودی خودای لێبێت) دەكات.

پێغەمبەریشمان (دروودی خودای لێبێت) ئامادەیی خۆی نیشان داوە بۆ بینینی، خۆ پێغەمبەرمان (دروودی خودای لێبێت) لە ئاست هیچ كەسێكدا خۆبەزلزان نەبووە. شوانەكە كە پێغەمبەر (دروودی خودای لێبێت) دەبینێ، زۆر سەرسام دەبێ، گەلێك پرسیاری لەمەڕ ئیسلامەتی لێدەكات. لە بەرانبەر ئەو وەڵامە جوانانەی وەریدەگرێتەوە، بڕیار دەدات موسوڵمان ببێ:

– ئەی پێغەمبەری خودا! من لە دڵەوە باوەڕم بەوە هەیە كە خودا هەیە و تاك و تەنیایە، تۆش پێغەمبەری ئەویت. حەز دەكەم لەلات بمێنمەوە. ئەو ڕانەمەڕەی دەیلەوەڕێنم هی جوولەكەیەكی

خەیبەرییە، چۆن دەتوانم لە بەرپرسیارێتیی ئەم ئەمانەتە ڕزگارم ببێت؟

ئەم بەرزیی هەستی بەرپرسیارێتییەی، کە تازە هاتبووە ڕیزی موسوڵمانانەوە، پێغەمبەرمان (درووودی خودای لێبێت) زۆر دڵخۆش دەکات. پێغەمبەر (درووودی خودای لێبێت) بە شوانەکە دەڵێت:

– مەڕەکان ڕووەو قەڵاکە لێخوڕە و سپاردەی خودایان بکە. ئەوان خۆیان دەچنەوە ناو قەڵاکە و خاوەنەکەیان دەدۆزنەوە.

ئەویش هەر وا دەکات، ڕانەمەڕەکە ڕووەو قەڵاکە بەڕێ دەکات. ئینجا دەستبەجێ دێتەوە خزمەت پێغەمبەر (درووودی خودای لێبێت) و داوای شمشێرێکی لێدەکات.

پێغەمبەریش (درووودی خودای لێبێت) لێی دەپرسێ:

– چ کارت بە شمشێرە؟



– دەمەوێ لە ڕێی ئەو ئیسلامەی باوەڕم پێهێناوە بچمە شەڕەوە و تیرێك لێرەم (ئاماژە بە قوڕگی دەکات) بدات و شەهید ببم.

پێغەمبەریش (درووودی خودای لێبێت) پێی دەفەرموێت:

– ئەگەر خودا نیازەکەت قبووڵ بکات، ئەوەی دەیڵێیت دەبێت.

شوانه یەك كاژێر موسوڵمان بووه كه به دەم وتنەوەی "یان سەركەوتن یان شەهید بوون" بۆ سەر دوژمنانی خودا هەڵمەت دەبات.

دوای ماوەیەك لاشەی ئەم موسوڵمانە نوێیە لەبن دیواری قەڵاكە دەدۆزرێتەوە، دەهێنرێتە حزووری پێغەمبەر (دروودی خودای لێبێت). پێغەمبەر (دروودی خودای لێبێت) دەبینێ، وەك ئەوەی خۆی ئامادەی بۆ كردبوو، تیرێك دابووی لە بینەقاقای و شەهیدی كردبوو، بە زەردەخەنەیەكەوە لە شەهیدەكە دەڕوانێ. لە بارەی زەردەخەنەكەیەوە لێی دەپرسن، ئەویش دەفەرموێت:

– خودا نیازەكەی قبووڵ كرد. لاشەكەی لێرەیە لەبەردەممان، بەڵام ڕۆحەكەی بەرەو بەهەشت هەڵفڕیوە، ئێستا لە بەهەشتە و لای پەروەردگار میوانە، وا لەگەڵ ئەهلی ئەوێ خەریكی یەكترناسینە. بۆیە بزەم هاتێ.

– ئافەرین محەمەد! ڕووداوەكەت زۆر جوان گێڕایەوە. چیرۆكی ئەو هاوەڵانەی تەنها بە باوەڕ، بەڵام باوەڕێكی تۆكمە و بەهێز، و بێ هیچ پەرستشێك بەهەشتیان بەدەست هێناوە ئاوایە. هیچ پەرستشێكی ئەنجام نەداوە، یان ڕاستتر بڵێین كاتی نەبووە بۆی، بەڵام بە گیان باوەڕداریی خۆی سەلماندووە.

***

- با بزانین ئۆیا چیمان بۆ دەگێڕێتەوە؟

وا دیار بوو ئۆیا شەرمی دەکرد، پێی وا بوو ناتوانێ بە جۆرێک بکەوێتە گێڕانەوە، کە شان لە شانی محەمەد بدات.

- مامۆستا! بەسەرهاتەکەی لای من کەمێک کورتە. لە مەلایەکم پرسی، ئەویش ئەمەی پێوتم. زۆر هەوڵم دا، لە کتێبدا نەمدۆزییەوە. بۆیە ڕەنگە نەتوانم بەجوانی بیگێڕمەوە.

- تۆ دەست پێبکە، دڵنیام جوانی دەگێڕیتەوە. ئەگەر کەموکوڕییەکیشی هەبوو، بۆتی تەواو دەکەین...

- ئەم نموونەیەی منیش، گرنگیی باوەڕ دەردەخات. هەر کەس بیەوێ، دەتوانێ باوەڕ بێنێ و نابێ بەربەستیی لێبکرێت. ئەو بەسەرهاتەی دەستم کەوتووە ئەمەیە:

لە یەکێک لە جەنگەکاندا، حەزرەتی ئوسامە کە هاوەڵێکی زۆر خۆشەویست بووە لە دڵی پێغەمبەردا (دروودی خودای لێبێت)، بە شەڕکەرێکی بێباوەڕەوە زۆر خەریک بووە، کابرا زۆر شەڕزان و سەرسەخت بووە و چۆکی بۆ حەزرەتی ئوسامە دانەداوە و ویستوویەتی هەر چۆنێک بێت بیبەزێنێ. حەزرەتی ئوسامە کە گەلێک دلێر و قارەمان بووە، ئەگەر بەزەحمەتیش بووبێ، توانیویەتی کابرا بە زەویدا بدات و پێ بنێتە سەر سینگی. شمشێرەکەی لێبەرز دەکاتەوە و هەر کە خەریک دەبێ بدات لە ملی، کابرا یەکسەر

شایەتومان دێنیٚ... حەزرەتی ئوسامە سەرەتا دوودڵ دەبیٚ، بەڵام دواتر دەدات لە ملی و دەیکوژێت. وای لێك داوەتەوە ئەو کابرایە دوژمنی خۆی و دینەکەیەتی، بەڵام ئێستا لە ترسی مردن دەیەویٚ ببێت بە موسوڵمان، بۆیە لەسەری پێویستە پێی هەڵنەخەڵەتیٚ و ملی بپەڕێنیٚ.

دواتر کاتێك ئەم ڕووداوە بۆ پێغەمبەری خودا (دروودی خودای لێبێت) دەگێڕڕێتەوە، زۆر تووڕە دەبیٚ و خەم دایدەگریٚ. چەندین جار بە ئوسامەی وتووە:

– ئوسامە! بۆ کوشتت؟ ئوسامە! بۆ کوشتت؟

حەزرەتی ئوسامە هۆکارەکەی ڕوون کردووەتەوە و وتوویەتی ڕەنگە مەبەستی بوو بیٚ فریوی بدات. بەڵام پێغەمبەر (دروودی خودای لێبێت) لەو ئوسامە خۆشەویستەی بەر دڵی، ڕەنجاوە و ئەم دڵڕەنجانەشی ماوەیەکی زۆر درێژەی کێشاوە. ئەمە لە کاتێکدا کە بەئاسانی لە کەس تووڕە نەبووە. کاتێکیش حەزرەتی ئوسامە پێی وتووە: "ئەو پیاوە تەنها بۆ پاراستنی گیانی خۆی، موسوڵمان بووە"، پێغەمبەر (دروودی خودای لێبێت) وتوویەتی:

– مەگەر دڵیت کردەوە و سەیری ناویت کرد؟

***

- ئافـەرین بـۆ تـۆش ئۆیـا! ئـەم ڕووداوە ڕاسـتەقینەیە ئـەوە دەردەخـات بـاوەڕ چـەند گـرنگ و پـڕ بایەخـە و پێغەمبەریشـمان (دروودی خودای لێبێت) ئەم مەسەلەیەی چەند بـەگرنگ وەرگرتـووە. ئێستا لێتان دەپرسم: ئەم نموونەیەی ئۆیا، چیتان بەبیر دێنێتەوە؟

نزیکەی هەموویان لالە حەسەنیان بەبیر هاتبووەوە.

وتم:

- ئازیزەکـانم! ڕەنگـە لالـە حەسـەن ئـەم ڕووداوەی نـەزانیبێ، وا نییـە؟ ئەگـەر بیزانیایـە، بـاوەڕ ناکـەم ڕێگریـی بکردایـە لەبـەردەم شایەتومان هێنانی هرلاکیان دا.

## مرۆڤی کامڵ ئەوەیە کە باوەڕدارە

(لە دڵی خۆمدا) وتم: بـا دوای ئـەم پێشـەکییە، باسـی یەکـەمین و سـەرەکیترین پایـەی بـاوەڕ بێنینـە گـۆڕێ، وەلـێ لـەم پۆلـەدا چـەند زەحمەتـە بتـوانی یەکسـەر بێیتـە سـەر ئـەم باسـە... یـەکێك لـەو قوتابییانەی زۆر کەم بەقسە دەهات، دەستی هەڵبڕی. وتم:

- ڕۆڵە! بڵێ.

- مامۆستا بەتەواوی لەوە گەیشتم هەر کەسێك شـایەتومان بێنـێ و لە دڵەوە بە ماناکەی قایل بـێ، بـە موسـوڵمان دادەنرێـت. لـەوەش

گەیشتم کە هەر کەسێك بیەوێ دەتوانێ شایەتومان بێنێ و کەس بۆی نییە کۆسپ بخاتە سەر ڕێی. بەڵام من وام بیستووە کە «قەرەچەکان» لە دەرەوەی ئەمەن. دەڵێن: ئەگەر قەرەچێك بیەوێ ببێ بە موسوڵمان، سەرەتا دەبێ ببێ بە دیان، ئینجا ببێ بە موسوڵمان...

– نەخێر، جەرگەکەم! ئەمە زۆر هەڵە و بێ بنەمایە، لە بە کەم زانینی ئەو مرۆڤانەوە سەرچاوە دەگرێ کە قەرەچیان پێدەوترێ. لە ئیسلامدا شتی وا نییە. هەر کەسێك جا قەرەچ بێ، ڕووس بێ، ئینگلیز بێ، فەڕەنسایی بێ، تورك بێ، عەرەب بێ یان لە هەر نەتەوەیەکی تر بێ، کە ویستی ببێتە موسوڵمان، شایەتومان دێنێ و دەبێ بە موسوڵمان. بۆ هیچ نەتەوەیەك، یاسایەکی بەدەر لەمە نییە. چونکە مرۆڤ هەر مرۆڤە، جا سەر بە هەر نەتەوەیەك بێت. وا نەبێت، دەبێت بە ڕەگەزپەرستی. واتە ئەگەر بۆ هەندێ نەتەوە ئاسانکاری بکرێ و بۆ هەندێکی تر زەحمەتی، ئەوە دەبێتە جیاوازی کردن لە نێوان نەتەوەکان، ئەمە ڕەگەزپەرستییە، ڕەگەزپەرستییش زۆر بەتوندی لەلایەن ئاینەکەمانەوە ڕەت دەکرێتەوە.

چونکە هەڵبژاردنی نەژاد بە دەستی مرۆڤ نییە، مرۆڤیش تاوانبار ناکرێت لە شتێك بەدەستی خۆی نەبێت.

هەموو مرۆڤێك خودا خەلقی كردووە و لە كاتی لەدایك بوونیشدا لە ڕووی باوەڕەوە هەموومان وەكو یەكین، ئەوەتا پێغەمبەرمان (دروودی خودای لێبێت) ئەوەی دەربڕیوە كە هەموو منداڵێك لەسەر فیترەتی ئیسلام لەدایك دەبێ، بەڵام دواتر دایك و بابی بەرەو بیروباوەڕی دیكە ئاڕاستە دەكەن.

یەكێك لە قوتابییە هەست ناسكەكان قسەی كرد و بەم شێوەیە كۆتایی بە باسەكە هێنا:

– مامۆستا! كەواتە دەبێ ئەوەی كە منداڵە گچكەكان و بە تایبەت ساواكان ئاوا ئێسك سووكن و هەموو كەسێك خۆشی دەوێن، بە هۆی ئەمەوە بێ.



● هەموو منداڵێك بە شێوەیەكی لەبار بۆ ئیسلامەتی لەدایك دەبێ، بەڵام ئەی دواتر؟...

– بەڵێ، وایە... ئەوان بە هۆی ئەوەی بە موسوڵمانێتی بەدیدەهێنرێن، دڵساف و بێگوناهن. كەسی واش لەلای هەموو كەسێكی كامڵ خۆشەویستە.

– مامۆستا! بۆ كەسی ناكامڵیش هەیە؟

– ئەی بۆ نا؟ كەسانێك هەن، تایبەتمەندییەكانی مرۆڤایەتییان لەدەست داوە و بەو هۆیەشەوە لە بازنەی مرۆڤایەتیی چوونەتە

دەرەوە. بەمانــە –وەك پێشــتریش ئامــاژەم پێــدا– دەوتــرێ ئــەو کەسانەی دەستیان لـە مرۆڤـایەتی کێشـاوەتەوە. ئەوانـە کـردار و ڕەفتاریان زیاتر بە هی ئاژەڵ دەچێت نەك مرۆڤ. وەك نموونـەی ئـەو دایکانەی ئامـادەن جگەرگۆشـەکانیان لەبـەر مزگـەوتێك فـڕێ بـدەن. دایکێك دایك بێ، ئامـادە نییـە لـە بەرانبـەر مەرگیشـدا دەسـتبەرداری منداڵی خۆی ببێت. بەڵام دیـارە ئـەو جـۆرە دایکانـە هەسـت و نـاخی خۆیان لەدەست داوە.

نموونەیەکی تر ئەو کەسانەن کە بۆ سـێ چـوار قـرووش دەسـتیان دەچێتە خوێنی دایك و باوکی خۆیان. دەکرێ بەمانـە بـوترێ مرۆڤـ؟ ئەوەی ئەمانە دەیکەن، هیچ ئاژەڵێکی دڕندەش دەیکات؟!

کامڵ بوونی ئینسان بەندە بە باوەڕەوە. ئایا کەسێك بـاوەڕی بـە خــودا و ڕۆژی دوایــی و، بەهەشــت و دۆزەخ هــەبێ، دەســت لــە مرۆڤـایەتی دەکێشێتەوە؟ خۆی دادەبەزێنێتە ئاستێك کە بـە جۆرێـك بجووڵێتەوە ئاژەڵیش بـیری لێنەکاتـەوە؟ ئەگـەر ئـەو کەسـە بـاوەڕی نەبێت، دەتوانین زۆر بەئاسـانی بـە "بـەڵێ" وەڵامـی ئـەم پرسـیارانە بدەینەوە.

مرۆڤ کە باوەڕی نەبوو، دەبێ بـە ماددەپەرسـت. چـونکە هـەموو شـتێك لـە پێنـاوی پـارە و پـوول و کـەیف و سـەفادا دەکـات. ڕژد و بەرژەوەندیخواز دەبێ. چونکە ئامادەیە لە پێناو بەرژەوەندیی خۆیدا

هەموو ناهەقییەك بكات، گوێی پێ نادا ئازاری هەموو كەسێك بدات، با دایك و باوكی خۆیشی بێت. تاكە شتێك بتوانێ ڕێ لە مرۆڤی بێباوەڕ بگرێت، جەندرمە و پۆلیسە. لە ترسی ئەوەی نەوەك بیگرن و فڕێی بدەنە زیندانەوە، لەوە بەولاوە ترسێكی تری نییە. ئایا پێمان دەكرێت بەسەر هەر كەسێكەوە پۆلیسێك ڕابگرین؟



منداڵێك كە خزمی (ڤۆڵتێر)ی بەناوبانگ بوو، هێشتا تازە تەمەنی نۆ ساڵان بوو، بە مەترانێك ناسێنرا.
مەترانەكە پێی وت:
- ڕۆڵە گیان! ئەگەر پێم بڵێیت خودا لە كوێیە، پرتەقاڵێكت دەدەمێ.
منداڵە زیت و ورپاكەش ئەم وەڵامەی دایەوە:
- ئەگەرتۆش پێم بڵێیت خودا لە كوێ نییە، دوو دانە پرتەقاڵت دەدەمێ.

محەمەدی فەیلەسووف نەیهێشت هەلەكەی لەكیس بچێ:

– نەوەڵڵا مامۆستا، ناكرێ!

– بۆ؟

– چونكە بۆی هەیە لە كۆمەڵگەیەكدا زۆر كەس مەیلی تاوان و خراپەكاریی هەبێت. ئەگەر بێت و بەسەر هەر كەسێكەوە پۆلیسێك دابنێین، بودجەی حكومەت بەس بە مووچەی پۆلیس ڕاناگات. ئەمە جگە لەوەی پۆلیسیش هەر مرۆڤە، بۆیە بۆ ڕێگرتن لەوەی كاری

خراپە ئەنجام بدات، دەبێت پۆلیس لەسەر ئەو پۆلیسانەش دابنێین، ئینجا لەسەر هەر یەکێك لەو پۆلیسانەش پۆلیسی تر... هتد.

– باشە ، محەمەد تێگەیشتین. گەر پۆلیس لەسەر پۆلیسیش دابنرێت، کۆمەڵگە هەر هەمووی دەبێت بە پۆلیس. بەڵام هێشتاش هەر ناتوانرێ بەر لە خراپەکاریی بگیرێت، وا نییە؟

– بەڵێ وایە، مامۆستا!

– ئەی چارە؟

بەپێی ئەو چارەسەرەی هەموو قوتابییان لەسەری کۆك بوون، دەبێ پۆلیس و پاسەوان و جەندرمە لە دڵی خەڵکی دەربهێنرێت، لە جێیدا هەستێکی وا بروێنرێت کە ڕێکیان بخات و ڕێگرییان لێبکات لە خراپەکاریی، ئەمەش تەنها لە ڕێی باوەڕ بە خوداوە دێتە دی. ئەوەی ترسی خودای لە دڵدا نەبێ، دوور نییە بکاتە ئاستی دڕندەترینی گیانلەبەران. سەیرکەن ئەم ڕاستییە چەند جوان گوزارشتی لێکراوە:

بەر لە هەر کەسێك لە خوا بترسن
ئینجا لەوانەی لە خوا ناترسن



(محەمـەد عـاكيف) ی شـاعير ئـەم ڕاسـتييەی بـەم جـۆرە ڕوون كردووەتەوە:

باوەڕ گەوهەرە، گەلێك سەنگینە
دڵـی بێبـاوەڕ، بـارە لـە سـینە

بـەڵێ "ئيمانـە ئينسـان دەكاتـە ئينسـان، نـەك هـەر ئەوەنـدەش، دەيكا بە سوڵتان".

هەر بەڕاستيش ئەوەی كە مرۆڤ كامڵ ببێ، بەرز ببێتەوە و بگاتـە پلەيەكی وا فريشتەكان بپەڕێنێ، تەنها لە ڕێـی بـاوەڕەوە دەبـێ. ئـێ خۆ دڵيش بێ باوەڕ نايكرێ، بەردەوام دەيەوێ باوەڕ بێنێ. بەدرێژايی مێـژوو، خـەڵكی باوەڕيـان بـە شـتێك هێنـاوە. هـەرگيز ڕووی نـەداوە كۆمەڵگەيـەكی بێبـاوەڕ، بگـرە تـاكی بێبـاوەڕ هـەبووبێ. بـەڵام ئـەوە گرنگە كە باوەڕمان بە چی هەبێت. كاتێك ناچارين باوەڕ بهێنين، ئايا جێی خۆی نييە باوەڕ بە شايانترينيان بێنين؟



## سێ بانگەشەی نکووڵیکاران

ئەو بابەتەی لە هەموو شتێك زیاتر قوتابییانی قۆناغی ناوەندی مەراقیانە، بوونی خودایە. نەك هەر لە وانەی ئاین، بەڵكو لە زۆر بابەتی وانەكانی تریش ئەم مەسەلەیە دەكەنەوە.

بۆ ئەوەی بتوانین بە ئەقڵ، بوونی خودا شیبكەینەوە، سەرەتا ئەم كورتە باسەم بۆ كردن:

– بوونی خودا، بۆ كەسێك بیر بكاتەوە، ڕاستییەكی حاشا هەڵنەگرە. ئەوەتا ئێستا زۆر ڕوونە كە ناتوانرێ بیر لە پێچەوانەكەی بكرێتەوە، چ جای ئەوەی بسەلمێنرێ. بەو مانایەی: لەوەتەی دونیا دونیایە تا ئێستاكە كەسێك نەبووە توانیبێتی بیسەلمێنێ خودا بوونی نییە، كەچی سەدان هەزار بەڵگە هەیە لەسەر هەبوونی.

زۆرن لەوانەی بوونی خودا ڕەت دەكەنەوە، ئەگەر بتوانرایە بسەلمێنرێ، هەر چۆنێك بووایە دەیانتوانی بیكەن. كەواتە یەكەم

شتێك كە پێویستە بیزانین ئەو ڕاستییەیە کە "نکوولی کردن لە بوونی خودا" سەلماندنی بۆ نییە. بەپێچەوانەوە، لەگەڵ بەرەوپێشچوونی زانستدا، ڕێگەی تازە دێنە ئاراوە بۆ سەلماندنی بوونی و، کار بەرەو ئەوە دەچێت ئەوەی باوەڕی نییە باوەڕ بێنێ و ئەوەیشی باوەڕدارە باوەڕەکەی تۆکمەتر بکات.

ڕاستییەکی تر ئەوەیە کە باوەڕ بە خودا، بەدرێژایی مێژوو، لە دڵی یەکەم مرۆڤ تا مرۆڤەکانی ئەم سەردەمە، بوونی هەیە. ئەمە چ باوەڕێکە کە مرۆڤەکان لە هیچ دەورانێکدا بێ ئەو نەیانکراوە؟ ئەمە ئەو باوەڕەیە کە لەگەڵ مرۆڤەکاندا لەدایك بووە. ئایا چۆن چووەتە دڵی هەموو مەردمەوە؟ چۆنە وا هەزاران ساڵە بەردەوامە و ڕۆژ بە ڕۆژیش بەهێزتر دەبێت؟ ئەرێ هیچ باوەڕێکی دیکەی وا بەهێز و خۆڕاگر هەیە؟ دەبێ ئەوەش بزانین کە نکوولیکاران لە هەموو سەردەمێکدا کەمینە بوونە.

هەندێ لە نکوولیکاران دەڵێن مرۆڤە بەراییەکان، لەبەر ئەوەی یاساکانی بوونەوەرە سروشتییەکانیان نەزانیوە و لێیان ترساون، بۆیە لەبەر ئەم ترس و بێدەسەڵاتییەیان، باوەڕ بە خودایان داهێناوە. ئەوە شتێکی حاشا هەڵنەگرە کە ئەمە بۆچوونێکی ناڕاست و بێبنەمایە. ئێستا هۆکاری ڕووداوە سروشتیەکانی وەك بەفر و باران و تەرزە و بوومەلەرزە و برووسکە و گەواڵە، زۆر بەچاکی دەزانرێت.

خەریکە رازی هەموو ڕووداوە سروشتییەکان ئاشکرا دەبیٚ. کاتێك ئادەمزاد کەوتە ئەوەی لەمانە نەترسیٚ، نەك وای لێهات بێباوەڕ ببیٚ، بەڵکو وای لێهات ئەوەندەی تر باوەڕ بێنیٚ. کەواتە ترس لە ڕووداوە سروشتییەکان و دەستەوسانیی لە ئاستیاندا، هۆی لەدایك بوونی باوەڕ بە خودا نییە.

مرۆڤ هەر کە لەدایك دەبیٚ، لە ناخی خۆیدا هەست بە بوونی باوەڕ بە خودا دەکات. باوەڕ لە کاتی لەدایك بوونەوەیە، شتێك نییە دواتر بەدەست بخریٚ. پێغەمبەریشمان (دروودی خودای لێبێت) لە فەرموودەیەکیدا ئاماژە بەوە دەدات مرۆڤ بە موسوڵمانێتی دێتە دونیاوە.

چاودێری پۆل دەستی هەڵبڕی، گۆڤارێکیشی بەدەستەوە بوو، وتی: – مامۆستا لەبەر ئەوەی خودای گەورە دەزانێت کەسانێك هەن نکوولّی لە بوونی دەکەن، بۆیە ئیمزای خۆی لەسەر هەموو دڵێك کردووە. ئەها سەیری ئەم وتارەی ناو ئەم گۆڤارە بکەن، زۆر بەجوانی ئەمە ڕوون دەکاتەوە.

سەیرم کرد، هەر بەڕاستی بە شێوەیەکی زۆر سەرنج ڕاکێش و بە ڕێنووسی قورئانی نووسراوە «الله». ئەمە ئیمزایەکی وایە هەقە نکوولّیکاران لە ئاستیدا شەرم دایان بگرێت. هەستیارترین و گرنگترین

ئەندامی لەشی مرۆڤـ کە دڵە، ئیمزای بەدیهێنەری بەسەرەوەیە، ئەمـە وەك «مارکە» یان «مۆر»ێك، جاڕی بوونی خودا دەدات.

***

- بەڵێ ڕۆڵەکانم! ئیتر وایـە... خـودا لەسـەر دڵەکانیشـمان نـاوی خۆی نووسیوە، کەچی هێشتا کەسانێك نکوڵیکار دەرچوونە، ئەگـەر کەمیش بن، هەن... حـەز دەکـەن بـا یەکـەم جـار بێینـە سـەر باسـی ئـــەوەی ئـــەوان چ بانگەشـــەگەلێك دەکـــەن و ویســـتوویانە بـــە چ بیرکردنەوەیەك، یان ڕاستتر بڵێین بیرنەکردنەوەیەك، بـاوەڕ بـە خـودا نەهێنن. دەکرێ بۆچوونەکانیان بەسەر سێ خاڵدا پۆلێن بکەین:

١- بوونەوەر و کاڵاکان، لەلایەن هۆکارەکانەوە بەدیدەهێنرێن.

٢- بوونەوەر و کاڵاکان، لە خۆیانەوە و بە شێوەی «ڕێککەوت» دێنـە بوون.

٣- سروشتیین، سروشت بەدییان دێنێ.

ئەگەر بتوانین ئەم سێ بانگەشەیە پووچەڵ بکەینەوە، ئەوە تـەنها بـاوەڕ دەمێنێتـەوە. بـەو مانایـەی ئەگـەر بوونـەوەرەکان لەلایـەن هۆکارەکان و سروشتەوە بەدینـەهێنرابن و لـە خۆشـیانەوە نـەبووبن، ئەی کێ بەدیی هێناون؟ ئەو کات وەك چوارەم ئەگەر، ناچارین بڵـێین «خودا» بەدیی هێناون، چونکە ناکرێ بانگەشەیەکی تر بکرێت.



## ئایا ڕێی تێدەچێ هۆکارەکان خولقێنەر بن؟

سەرەتا با باسی ئەوانە بکەین کە دروستبوون و هاتنە ئارای بوونەوەر و کاڵاکان بە هۆکارەکانەوە دەبەستنەوە، ئەوان دەڵێن: "هەموو شتێك لەلایەن هۆکارەکانەوە دێنە بوون، واتە هۆکارەکان دەیانخولقێنن". بۆ نموونە: باران... کێ بارانی بەدیهێناوە؟ ئەوانەی ئەمە بە هۆکارەکان دەبەستنەوە دەڵێن: " ئاوی دەریا و دەریاچەکان بەهۆی گەرمییەوە دەبێ بە هەڵم، بەرز دەبێتەوە و کاتێکیش بەر چینی هەوای ساردی بەرزاییەکان دەکەوێت، بە شێوەی باران دێتە خوارەوە. واتە ئەوەی باران دەخولقێنێ

هۆکارەکانە. ئەو هۆکارانـە چـین؟ سـەرەتا هـەوای سـارد و دواتـریش هەوای گەرم. ئەم دوو هۆکارە سەرەکییە دەبنە هۆی دروسـت بـوونی باران"

ئەمە لە کاتێکدایە کە بەستنەوەی باران بە هۆکارەکانەوە هەڵەیە. بەم ڕستەیەی دوایی بوو بە ژاوەژاو.

– مەگەر زانستیش هەر وا بـاران لێـك ناداتـەوە؟ ئـەی هـەر ئەمـە ڕاستییەکە نییە؟

وتم:

– ئەوەتا کەسانێکی وەك ئێوە –کە هەر بە ڕووکەش لە بابەتەکـە دەڕوانن و قـووڵ بیرناکەنـەوە– بەهەڵـەدا دەبـەن. ڕاسـتە بـاران بـەم شێوەیە دێتە بوون. بـەڵام ئەمـە تـەنها ئـەوەمان پێـدەڵێت کـە چـۆن دروست دەبێ، نەك ئەوەی کێ دروستی دەکات.

بـەم ڕوون کردنەوانـە ڕەخنـەکانیان وەسـتا، بـەڵام دەموچـاویان ئـــەوەی لێدەخوێنرایـــەوە هێشـــتا بەتـــەواوی دڵیـــان ئـــاوی نەخواردووەتەوە. بۆیە پێویست بوو هەندێ ڕوونکردنـەوەی زیاتریـان بدرێتێ. وتم:

– ئێوە لە تاقیگەدا تاقیکردنەوە فیزیاییەکان ئەنجام دەدەن، بـۆ نموونە تاقیکردنەوەی چۆنیەتیی دروست بوونی بـاران. گومـانی تێـدا نییـە ئـەو هۆکارانـەی بـەکاریان دەهێـنن، پێویسـتن بـۆ ئـەوەی

تاقیکردنەوەکـە بەئـەنجام بگەیـەنن. ئەگـەر ئاوەکـە نەکرێتـە هـەڵم و هەڵمەکـەش لـە چـینێکی سـارد نـەدرێ، مەحاڵـە تاقیکردنەوەکـە بێتەجێ. بەڵام ئەوە کێیە کەرەستە پێویستەکان و هۆکارەکان، واتـە ئاوەکە و گەرم کردنەکەی و چینە ساردەکە ئامادە دەکات؟ ئایا ئـەم هۆکارانـە هـەر لـە خۆیانـەوە لەیـەکتر کۆدەبنـەوە و بـاران دروسـت دەکەن، یان لەلایەن یەکێکەوە و پێشتر ئامادە کراون؟

ئەو قوتابییەی پرسیارەکەم لێکرد، وەڵامی دایەوە:

– بێگومان پێشتر مامۆستای زانستمان ئامادەی دەکات...

وتم:

– کەواتە تـەنها بـوونی هۆکارەکـان بـەس نییـە، بـەڵکو پێویسـتە کەسێك هەبێ وەك پێویست ئامادەیان بکات و بەکۆتاییان بگەیەنێت، وا نییە؟

کەواتە هەندێ ڕووداو و کاڵا و بوونەوەر لە ڕێی چەند هۆکارێکـەوە دێنـە بـوون. ئـەوە نییـە هۆکارەکـان بەمـە بـزانن و ئامادەکـاریی بـۆ بکەن.

گەرەکە کەسێکی بەتوانا و زانا هۆکارەکان بخولقێنێ و ئامادەیـان بکات و وەك پێویست ڕیزبەندیان بکات.

بۆ نموونە: ئایا ئەگـەر گـەرمی نەبووایـە، بـاران دەبـوو؟ بـا بڵـێین ئـەوە گـەرمییش هـەبوو، بـەڵام توانـای هەڵماندنی نەبووایـە، دیسـان

باران دروست نەدەبوو. یان ئەگەر چینی هەوای سارد لە بەرزاییەکاندا نەبووایە؟...

ئیتر هەموو بە یەك دەنگ دەیانوت: "باران نەدەبوو"

– کە وا بوو چۆن ئەم هەموو هۆکارە هەر لە خۆیانەوە لە یەکتر دەگەن و وەك ئەوەی پێویستە دەچنە سەرەوە. ناکا ئەم هۆکارە



بێفامانە لە نێوانی خۆیاندا ڕێککەوتنیان کردبێ و وتبێتیان با یەك لە دوای یەك ئەرکی سەر شانمان بەجێ بێنین تا مرۆڤ و ئاژەڵ و ڕووەکەکان بێ ئاو نەمێننەوە، چونکە ئەوان زۆر پێویستیان بە ئێمەیە؟

مانای وایە کەسێك هەیە دەتوانێ وا لە ئاو بکات ببێتە هەڵم، ئینجا بیکاتە بەفر و باران و تەرزە. هەر ئەویش هەوای گەرم و سارد بەدوای یەکدا دێنێ، تا ئەرکی سەرشانیان جێبەجێ بکەن.

– باشە، ئەو خاوەنی هێز و زانینە کێیە کە قسەی بەسەر ئاو و گەرمی و ساردیدا دەڕوا؟

– زاتی «ئەڵلا»یە.

ئەم قسە هاوبەشەی پۆل، ماندووێتییەکەی لەبیر بردمەوە. قوتابییەکان بابەتەکەیان باش هەرس کردبوو. نموونەکانی مەسەلەکە ڕووی لە زیاد بوون بوو.

## ئایا هۆکارەکان سێو دەخولقێنن؟

محەمەدی فەیلەسووف قسەیەکی ژیرانەی کرد:

– مامۆستا! هەر لەبەر ئەوەیە کە خودا باران دەبارێنێ، بۆیە کە وشکەساڵی دەبێ، خەڵکی دەردەچنە دەشتەوە و «نوێژە بارانە» دەکەن. ئەمە ئەوە دەگەیەنێت ئەوان خولقێنەری باران دەناسن.

– بەڵێ، محەمەد! خەڵکی ئێمە باوەڕدارە و خولقێنەری ڕاستی دەناسێ. ئایا ئەگەر داوایان لە هۆکارەکان بکردایە، نەدەبووە جێی گاڵتەجاڕی؟ با داواشیان لێبکردنایە، خۆ ئەوان گوێیان نییە تا ببیستن و لێی تێبگەن!...

(گوڵئەسەر) کە زۆر کەمدوو بوو، بەڵام کە قسەی دەکرد شتی زۆر سەرنج ڕاکێشی دەوت، دەیویست قسە بکات:

- بڵێ، کچەکەم!

- ئەرێ، مامۆستا! ئایا ئەوانەی باوەڕیان بە هۆکارەکان هەیە و دەڵێن هۆکارەکان باران دەخولقێنن، گەر وشکەساڵی بێت، لە هۆکارەکان دەپاڕێنەوە تا باران ببارێنن؟...

محەمەدی فەیلەسووف وتی:

- مامۆستا! با لەمەودوا گوڵئەسەر فەیلەسووفی پۆل بێت، چونکە پرسیارێکی زۆر جوانی کرد.

بەر لەوەی خەندەیان تەواو ببێ، وتم:

- با نموونەیەکی تریشتان بۆ بێنمەوە. ئەوسا هەمووتان بەجوانی لەوە دەگەن کە هۆکارەکانی دونیا ناتوانن ببن بە خولقێنەر.

بیر لە سێو بکەنەوە، بەڵێ سێو. (جانتاکەم کردەوە و سێوێکم لێدەرهێنا). سەیری ئەم سێوە بکەن.

نیوەی پۆلەکە هەستابووە سەر پێ. ئەوانەی دواوە دەیانوت: "با ئەوانەی پێشەوە دابنیشن، چونکە هیچمان لێ دیار نییە". سێوەکەم دانێ تا لەنێو خۆیاندا بیگێڕن. هەموویان بە جۆرێك سەیریان دەکرد، وەك ئەوەی یەکەم جاریان بێت سێو ببینن.

– ئێستا بیربکەنەوە، ئایا دەگونجێ ئەم سێوە میوەیەك بێ لەلایەن هۆکارەکانەوە خولقێنرابێ؟

هەموویان سەیری گوڵئەسەریان دەکرد و دەیانوت: "با فەیلەسووفی نوێ وەڵام بداتەوە".



● بۆ دروست بوونی سێوێك، زەوی و خۆر و ئاو پێویستن. مانای وایە هەر خولقێنەری کۆمەڵەی خۆرە کە سێویشی خولقاندووە.

سەرتاپای جیهانی بوونەوەران جێدەستی هەمان دەسەڵاتن.

وتم:

– نەخێر، دەبێ هەمووتان بیری لێبکەنەوە... سەرەتا با بیر لەو هۆکارانە بکەینەوە کە سێو دێننە ئاراوە. کارگەی سێو چییە؟

– دارسێو.

– ئافەرین بۆ ئێوە. بێگومان کارگەی سێو، دارسێوە. باشە دار پێویستی بە چی هەیە؟ بە خۆڵ، بەو خۆراکانەی لە خۆڵدا هەن، بە خۆر و، لە هەمووشیان گرنگتر بە ئاو... هەموو ئەم هۆکارانە دێنە یەك بۆ ئەوەی سێو بێتە بوون. باشە، ئایا ئەم هۆکارانەن سێو دێننە بوون؟

سەرەتا پرسیارەکەم لە محەمەد کرد، وتی:

– نەخێر، مامۆستا! هۆکارەکان ناتوانن ببن بە خولقێنەر، چونکە فامیان نییە. کاتێ ئەو هەموو هۆکارە بۆ دروست کردنی سێو گرد دەبنەوە، خۆیشیان نازانن خەریکی چین.

محەمەد زۆر بەکەیفەوە درێژەی دایێ:

– مامۆستا! هەر باشە نازانن خەریکی چین، چونکە بیانزانیایە چی دەکەن، سێومان زۆر بە گران دەست دەکەوت...! بەڵام بە هۆی ئەوەی دارسێو نرخی ئەو سێوەی بەرهەمی دەهێنێ نازانێ، ئەم سێوە نازدارانەمان دەداتێ تا تێری لێبخۆین.

محەمەد دەیویست بە جۆرێك درێژە بە قسەکانی بدات، فەیلەسووفێتیی خۆی بسەلمێنێت. بەڵام کەسانێکی تریش هەبوون قسەیان پێبوو.

قوتابییەکی تر وتی:

– مامۆستا! بۆ ئەوەی دارسێو یان ئەو هۆکارانەی خزمەتی دەکەن تا گەورە ببێ، ببن بە خولقێنەر، دەبێ زۆر ژیر بن، چونکە ئەوە کاری ژیرییە هەموو ئەو شتانەی بە کەڵکی سێوەکە دێن، –بێ ئەنجام دانی هیچ هەڵەیەك– لە گڵ هەڵێجێنێ. کاری وا لە توانای مرۆڤیشدا نییە.

– زۆر ڕاستە. ئێستا با بابەتەکە پوخت بکەینەوە. دار زانست و ئەقڵی نییە، خۆڵیش فامی نییە و ئاگای لە سێو نییە. ئەو هۆکار و ماددانەی سێو پێدەگەیەنن، هەموویان بێ زانست و هەستن. ئەم هەموو هۆکارە بێ زانست و بێ ئەقڵ و بێ هەستە، چۆن لە یەکدی کۆ دەبنەوە؟ چۆن پێکدێن و ئەم سێوە جوان و نازدارە بەرهەم دەهێنن؟ ئایا دەتوانن بیخولقێنن؟

لە پێنج تا دە قوتابیم پرسی، وەڵامیان ئەمانە بوو:

– نەخێر ناتوانن.

– بۆ خولقاندن زانست پێویستە، هێز پێویستە...

وتم:

– ئەی کەواتە کێ دەیخولقێنێ؟

– خودا!...

بەم تاکە وشەیە پۆل گیانی بەبەردا هاتەوە.

سێوەکەم خستەوە ناو جانتاکەم و وتم:

– ئازیزەکانم! ئەگەر ئەم سێوە ئەقڵی هەبووایە و بیتوانیایە بێتە گۆ، دەستخۆشیی لێدەکردن و چەپڵەڕێزانی دەکردن، چونکە خولقێنەری ئەو، نەک هەر ئەو بە تەنها بەڵکو هی هەموومان و هەموو شتێکتان دۆزییەوە...

***

- بەڵام ئایا لە ڕووی خولقاندنەوە، سێو بەنرختر و پڕهونەرترە یان ئاژەڵ؟ ئاژەڵ بەرز و باڵاترە یان مرۆڤ؟ گومانی تێدا نییە ئاژەڵ لە ڕووەك و، مرۆڤیش لە ئاژەڵ بەرزتر خولقێنراوە، وا نییە؟

باشە، ئێستا من لە ئێوە دەپرسم: ئایا ئەو هۆکارە نابیست و نابینا و نەزانانەی دەستەوسانن لە بەدیهێنانی باران یان سێوێك، دەتوانن ئاژەڵێکی زیندوو و لەوەش بەولاتر مرۆڤ بەدیبهێنن؟

- نەخێر ناتوانن.

- بۆ ناتوانن؟

- چونکە بێ ئەقڵێك ئاقڵێك و بێ گیانێك گیانداریکی پێناخولقێنرێ.

- ئافەرین بۆ تۆ ئۆیا! ئەی وا نییە ئازیزەکانم؟ خولقێنەرێك شتێك لە خۆیدا نەبێ، دەتوانێ بە مەخلووقەکانی بدات؟

یەك لەوانەی زۆر بیری دەکردەوە و کەم دەدوا، دەستی هەڵبڕی، ڕێم دا بدوێ:

- مامۆستا! ئەگەر هۆکارەکان ئاژەڵ و مرۆڤیان بخولقاندایە، یەکەم جار وایان لە خۆیان دەکرد لەوان بەرز و باڵاتر بن. ئەوە ڕێی تێناچێ و جێی پێکەنینە پێمان وا بێ هۆکارەکان خۆیان بە بێ ئەقڵی و کەڕی و کوێری دەهێڵنەوە، کەچی لەولاوە هەڵدەستن هەندێ

تایبەتمەندیی پڕپەها دەدەنە دروستکراوەکانیان، کە لە خۆیشیاندا نییە.

## داو و دەرمانەکان چۆن دروست دەکرێن؟



- بەر لەوەی ئەم باسە بەکۆتا بێنین، با نموونەیەکی تر بێنینەوە، تا بەتەواوی لەوە بگەین هیچ هۆکارێك ناتوانێ ببێ بە خولقێنەر. بیر لەم بابەتە بکەنەوە، ئەگەر نموونەی وەك ئەمەتان بە مێشکدا هات، لە دەفتەرەکانتاندا بینووسنەوە تا لە پۆلدا بیخوێننەوە، چونکە وەك پێشتریش ئاماژەم پێدا، بابەتی باوەڕ گرنگترین بابەتە بە لای موسوڵمانانەوە، لەبەر ئەوەی مەسەلەی بەدەست هێنانی یان لەکیس دانی خۆشییەکی نەبڕاوەیە.

با بێینە سەر نموونەکەمان:

"کارگەیەکی دروست کردنی داو و دەرمان بێننە بەر چاوتان. تاقیگەیەکی گەورەی تێدایە. لەسەر مێزە درێژەکان سەدان دەفر و کەمۆڵە ڕیز کراون، لەناو هەر یەکێکیاندا جۆری جیاواز لە ماددەی خاوی دەرمان دروست کردن هەیە. بۆ دروست کردنی دەرمانی باداری (ڕۆماتیزم) ڕێژەیەکی دیار لە هەر یەکێك لەو ماددانە وەردەگیرێت. ئێوە دەچن و لەو دەرمانسازەی لەویّ کار دەکات، دەپرسن:

– چۆن ئەو دەرمانە دروست دەکەن؟

ئەویش لە وەڵامتاندا دەڵێ:

– ئێمە دەرمان دروست ناکەین، بەڵکو بایەك هەڵدەکات و کەمۆڵەکان قلّپ دەکاتەوە، ماددەکان دەڕژێن و بەپێی پێوانەیەکی دیار تێکەڵ بە یەکتری دەبن. ئا بەم جۆرە دەرمانی ڕۆماتیزم دروست دەبێت، واتە چەند هۆکارێك دەیهێننە ئاراوە."

– ئایا باوەڕ بەم وەڵامە دەکەن؟

– نەخێر.

– بۆچی؟

نزیکەی سەرجەمی پۆلەکە دەیانویست وەڵامی ئەم "بۆ"یە بدەنەوە... زۆر باشە، ئەمە ئەوە دەگەیەنێت بابەتەکە بەتەواوی هەرس کراوە.

یەکێکم لەوانە هەڵساند کە زۆر کەمدوو بوو. وتی:

– مامۆستا! لەسەر هەموو دەرمانێك نووسراوە كە ڕێژەی ئەو ماددانەی لە خۆیان دەگرێت چەندە، كە بە (میللیگرام)ە. ئەگەر كەمێك هەڵەی تێدا بكرێت، دوور نییە لە چارەسەرەوە ببێتە ماددەیەكی زیانبەخش. كاتێك ماددەی ناو ئەو كەمۆلانەی بە بایەك هەڵدەڕژێن تێكەڵ دەبن، بێ هیچ پێوانەیەك تێكەڵ دەبن. مانای وایە نابێتە چارەسەر. ئەوەش لەبەر ئەوەی نە كەمۆڵەكان و نە ماددەكەی ناویان و نە باكەش فامیان نییە، وەك جەنابتان وتتان ئەم هۆكارانەش بێ ئەقڵ و كەڕ و كوێرن. بۆیە ڕێی تێناچێ ئیشێكی ئاقڵانە بكەن، چ جای دروست كردنی چارەسەر.

– ئافەرین بۆ تۆ، قسەیەكت كرد، بەڵام چ قسەیەك! شتێكتان هەیە بۆ قسەكانی هاوڕێكەتانی زیاد بكەن؟

– بەڵێ، مامۆستا!...

چاودێری پۆل وتی:

– وەك لەم نموونەیەشدا دیارە، شتێكی بێگیانی وەك دەرمانی ڕۆماتیزمیش بەهۆی هۆكاری ماددییەوە نایەتە بوون. كەواتە دروست بوونی گیانلەبەرێك و لەوەش گرنگتر مرۆڤێك، هەر ڕێی تێناچێ!

– با منیش قسەیەك بخەمە سەر قسەكانی كاكی چاودێر. ڕێی تێناچێ زیندەوەرێك بە هۆی هۆكاری نازیندەوە بێتە بوون. ئەمە ڕاستە، بەڵام ئەمە لایەنێكی ڕێ تێنەچوونی تریشی تێدایە. دەی با

بلێین ئەوە هۆکارەکان توانییان لایەنە ماددییەکەی شتەکە –واتە ئەو لایەنەی بەر دەست و دیدە دەکەوێت– دروست بکەن، ئەی مەگەر لایەنی مەعنەوییشی نییە؟ بۆ نموونە ئایا مرۆڤ جیا لە شکڵ و لایەنە ماددییەکەی، بوونێکی ڕۆحی و مەعنەوییشی نییە؟ چۆن هۆکارە ماددییەکان دەتوانن ئەو بوونە مەعنەوییەی کە پێی ناگەن، بێننە بوون؟

کەواتە لە هەر لایەکەوە لێی بڕوانین، دەبینین هۆکارە ماددییەکان ناتوانن ببن بە خولقێنەر.



## ڕێککەوت یان لەخۆوە بوون

دووەم گرووپیش لەوانەی کەوتوونەتە داوی بێباوەڕییەوە، دەڵێن: هەموو شتێك لەخۆیەوە بەڕێککەوت هاتووەتە بوون.

ئێستا با بێینە سەر باسی ئەوەی ئایا دەگونجێ کاڵا و بوونەوەرەکان لە خۆیانەوە بووبن؟ ئایا شتێك هەیە لەخۆیەوە هاتبێتە بوون؟ بیرێك لە بینای ئەم قوتابخانەیە بکەنەوە، کە واین تێیدا. ئەم بینایە چۆن دروست بووە؟ ئەگەر من پێتان بێژم ئەم بینایە لەخۆیەوە دروست بووە، باوەڕ دەکەن؟

بۆ نموونە ئەگەر بڵێم سێلاوێك ئەو بەردانەی كەوتوونەتە پێشی ڕایماڵیون و دواتر خستونیەتیە سەر یەك، بەم شێوەیە دیوارەكان دروست بوون و دوای ئەوەش قرمیتەكان سەركەوتوونەتە سەریان...

دیار بوو نموونەكە زۆر سادە بوو، هەموویان دەستیان كرد بە پێكەنین.

- دەی (مەتین)! تۆ گەلێك پێكەنییت، بۆیە دەبێ تۆ پێمان بڵێی، ئەم قوتابخانەیە چۆن چۆنی دروست بووە؟

- مامۆستا! ئەم بینایە بە نەخشە و پلان دروست كراوە. هیچ ڕێی تێناچێ لەخۆیەوە دروست بووبێ. چونكە ڕووبەری گشت پۆلەكان بەقەد یەكن، دالانەكان ڕێكوپێكن. وەك چۆن هیچ شتێك لەخۆوە نابێ، ئەم بینایەش هەر وایە. ئەگەر لەخۆوە ببووایە، ئاوا ڕێكوپێك نەدەبوو. هەر لە دەرگا و پەنجەرەكانییەوە بگرە تا دەگاتە قرمیتەكانی سەربان، هەموویان بە ئەندازەن، شتی وا لەخۆوە دەبێ؟

- ئەی ئافەرین مەتین! بەڵێ، ڕاست دەكەیت، بینایەكی وا كە بۆ مەبەستێكی دیار دروست كراوە، نە لەخۆیەوە دروست دەبێ و نە بەڕێككەوتیش.

با واز لەم بینا گەورەیە بێنین و بێینە سەر ئەم تەختە ڕەشە. ئایا ڕێی تێدەچێ ئەم تەختە سادەیە لەخۆیەوە دروست بووبێ؟

محەمەد وتی:

– نەخێر، مامۆستا! هیچ ڕێی تێناچێ. بەبێ هیچ گومانێک دارتاشێک هەیە کە دروستی کردووە.

– بە چی دەزانی؟ خۆ دارتاشەکە ناناسی؟

– نەخێر، مامۆستا! من ئەو دارتاشەی ئەم تەختەیەی دروست کردووە، نایناسم و نەشمبینیوە. بەڵام ئەگەر بیربکەینەوە، ئەقڵمان پێمان دەڵێ دارتاشێک هەیە ئەم تەختەیەی دروست کردووە. واتە لەخۆیەوە دروست نەبووە و نابێ...

– ڕاستە، با گوڵەسەریش نموونەیەکی ترمان لەم پۆلە بۆ بدۆزێتەوە.

گوڵەسەر ئاماژەیەکی بۆ وێنەیەکی سەر دیوارەکە کرد و وتی:

– مامۆستا! با لەو وێنەیە بڕوانین، ئەگەر بڵێم ئەم وێنەیە نیگارکێشێکی نییە، واتە لەلایەن هیچ نیگارکێشێکەوە نەکێشراوە و هەر لەخۆیەوە بووە، باوەڕ دەکەن؟

– نەخێر باوەڕ ناکەین!

من پرسیم:

– باشە بۆ باوەڕ ناکەن؟ بۆ ناتوانن وا بیربکەنەوە؟ ئایا ناکرێ کارتۆنەکە و بۆیەکان ڕێککەوتبن، یان بە هۆی باوە هاتبن و چووبن و هەر بەڕێککەوت ئەم نیگارەیان هێنابێتە بوون؟

نیازی وتی:

– نەخێر، مامۆستا! لە دونیادا نیگارێك نییە بێ نیگارکێش بێ، بێ هیچ گومانێك هەر نیگارەو لەلایەن نیگارکێشێکەوە کێشراوە. هەر بۆیە ئەم نیگارەش، کەسێك هەیە بە کێشانی هەڵسابێ.

– خێرە، نیازی؟! ناکا تۆش لەگەڵ نیگارکێشەکەی ئەم نیگارە تەعاروفت هەبێ؟



– نەخێر، مامۆستا! خۆ تەعاروفی ناوێ! هەر بەوەی لێی بڕوانین، دەتوانین بۆمان دەربکەوێ نیگارکێشێکی هەیە. لە هەر شوێنێك نیگارێکمان بینی، دەبێ بیر لەوە بکەینەوە کە نیگارکێشێکی هەیە...

– ئافەرین بۆ تۆش نیازی!...

کە ئافەرین بۆ کردنەکان زیادی کرد، ژمارەی ئەوانەش کە دەیانویست قسە بکەن زیادی کرد. نیوەی پۆلەکە دەستی هەڵبڕیبوو تا نموونە بهێنێتەوە...

– کاتمان کەمە، وا دیارە لە مەسەلەکە گەیشتوون. با ئێستا بابەتەکە گرد و پوخت بکەینەوە. با پرسیارێکتان لێبکەم: قەت بووە

بێئەوەی خۆتان ئەرکەکانتان بنووسنەوە، هەر لەخۆیانەوە لە دەفتەرەکانتاندا نووسرابێتنەوە؟

– نەخێر، قەت شتی وا نەبووە.

هەندێ لە قوتابییە تەمبەڵەکان خۆزگەیان پێدەخواست:

– ئای چەند خۆش دەبوو، ئەرکەکانمان هەر لەخۆیانەوە بنووسرانایەوە!

– وایە خۆش بوو، بەڵام ئایا ڕێی تێدەچێ؟

ئۆیا وتی:

– نەخێر، هەرگیز...!

– باشە ئۆیا! تۆ پێمان بڵێ بزانم، هەموو ئەم نموونانە چی دەسەلمێنن؟

– مامۆستا! ئەوە دەسەلمێنن کە لەم دونیایەدا هیچ شتێك لەخۆوە نابێ. هەر چییەك هەیە، بکەرێك یان دروستکەرێکی هەیە.

– بەڵێ، وایە کچە شیرینەکەم! لە دونیادا هەر چییەك هەبێ دروست کراوە، هیچی لەخۆیەوە نەبووە. ئەگەر تەختەیەکی سادە یان نیگارێکی چکۆلانە یانیش ئەرکێکی سێ چوار دێڕی لەخۆوە نەبن، چۆن ئەم گەردوونە مەزنە، ئەم هەموو زەوی و خۆر و هەسارە و مانگ و ئەستێرەیە لەخۆیانەوە دەبن؟

ئایا دەكرێ بڵێیت بێ هیچ دوودڵییەك نیگارێكی سادە نیگاركێشێكی هەیە، كەچی لەولاوە بێیت و نكوڵی لەوە بكەیت ئەو نیگاركێشە ڕۆحلەبەرە خالقێكی هەبێ؟



مەگەر ئەم كتێبی گەردوونە سادەترە لە ئەركێكی سێ چوار دێڕیی نێو دەفتەرەكانتان؟!

ئەم گەردوونە كتێبێكی ئەوەندە قەبەیە، هەموو تەمەنی مرۆڤـ بەشی ئەوە ناكات بتوانێ بیخوێنێتەوە و ڕازەكانی بدركێنێت. بە كتێبێكی ئاوا گەورە و پڕمانا دەڵێین لەخۆیەوە بووە و خۆشمان پێ ناقڵە!

– چاودێر! بە ڕای تۆ چی لە كەسێكی وا بكرێت، باشە؟

چاودێری پۆل یەکسەر زانی مەبەستم ئەو سوعبەتەیە کە هەموو جارێك دەمانوتەوە:

– مامۆستا! ئاوا کەسێك، یەکسەر دەبێ سواری ژمارە (٩٥)ی بکەین و لە نەخۆشخانەی دەروونیی (بەکر کۆی) داخڵی بکەین.

دیسان گوڵی خەندە لە پۆلدا کرایەوە.

***

دەستم دای لە تەختەسڕەکە – کە لە تەنیشت تەختەڕەشەکەوە بوو و– خستی. هەموویان بە بێدەنگی لە یەکیان دەڕوانی، داخۆ دەبێ ئێستا چی ڕوو بدا. تەختەسڕەکەم لەسەر ئەرز هەڵگرتەوە و خستمەوە شوێنی خۆی. جارێکی تر دەستم لێیدا و خستمەوە.

خەریك بوو سەرنج دانەکان بۆ سەرسوڕمان وەرچەرخێن، پرسیم:

– خۆشەویستەکانم! سەیرکەن، هیچ شتێك لەخۆیەوە ڕوو نادات، ئەها تەختەسڕەکەمان بە تەنیشت تەختەڕەشەکەوە وەستاوە، هیچ جووڵە ناکات. ئەگەر هیچ کاریگەرییەك نەکەوێتە سەری، ناکەوێتە سەر زەوی. بەڵام کاتێك هەر ئەوەتا پەنجەی لێدەدەم، دەمودەست دەکەوێت. مانای وایە ئەوە منم دەیخەم، خۆی خۆی ناخات. کەواتە کەسێك هەیە بەو کارە هەڵدەستێت.

ئێستا پێم بڵێن، ئایا ئەگەر من دەستی لێنەدەم یان کاریگەرییەکی تر خۆی نەخاتە ئیشەکەوە، ئەم تەختەسڕە دەکەوێتە سەر زەوی؟

– نەخێر، ناکەوێ...

– دەزانن بۆچی ئەم شتە سادەیەتان بۆ باس دەکەم؟ ئەها نیازی کەمێك لەمەو پێش پرسی: "ئایا خودا بۆ ئەوە بومەلەرزەی داناوە تا خەڵکی پەندی لێوەربگرن؟"، ئێستا کە کاتی هاتووە، وەڵامی پرسیارەکەی نیازیش دەدەمەوە.

لەوە گەیشتین کە هیچ شتێك لەخۆوە نابێ، بێ هیچ گومانێك کاریگەرییەکی لەسەرە. زانایان هۆکارەکانی بومەلەرزە ڕوون دەکەنەوە، ڕاستە، بەڵام ئایا ئەو هۆکارانە کارەکە دەهێننە جێ؟

دەستانێکی زۆر بە هەواوە بوون. زۆر باشە، دیارە زانیارییەکانی پێشوو لەبیر نەکراون.

– ئۆیا! بڵێ بزانم.

– مامۆستا! بومەلەرزە هۆکاری خۆی هەیە، کە زانایان ڕوونیان کردووەتەوە. وەلێ ئەم هۆکارانە شتانێکی بەتوانا و زانا نین تا بتوانن بڕیار بدەن. ئەوەی ئەو هۆکارانەی خولقاندووە، خودایە. خودا هەموو شتێکی ئەم دونیایەی بەستووەتەوە بە هۆکارەکانەوە، هەموو شتێکی بەپێی هەندێ ڕێسا ڕێکخستووە. خولقێنەری هۆکارەکان

خودایە، ئەوەی یاسا و ڕێساکانیشی داناوە هەر ئەوە. زانایان ئەم یاسایانە شی دەکەنەوە، بەڵام لەبەر ئەوەی ئاماژە بەوە نادەن کە ئەوەی ئەو هۆکارانەی داناوە خودایە، سەرمان لێ تێکدەچێ. ئایا ئەگەر هۆکاری ڕووداوەکانیان ڕوون بکردایەتەوە، لەگەڵیشیدا ئامەژەیان بەوە بدایە کە خولقێنەری ئەو هۆکارانە خودایە، نەدەبوو؟



– بۆ نا؟! ثۆیا! مەگەر حەقیقەتەکەش هەر ئەمە نییە. بەڵام بۆ کەسێك بیربکاتەوە و تێبگا، ئەگەر ئەوان نەشیڵێن هەر دەبێ، ئەها تۆ چەند جوان بیرت لێکردووەتەوە... بەڵام دیسانەوەش کەسانێك هەبووە وایان کردووە. بۆ نموونە ئەمریکاییەکان لە کتێبەکانی

قوتابخانەکانیانـدا یاسـای (لافۆیسـیەر)یـان لـەم ڕوانگەیـەوە لێـك داوەتەوە. کێ پێمان دەڵێ ئەم یاسا فیزیکییە چییە؟

– "هـیچ شـتێك لـە نەبوونـەوە نایاتـە بـوون، ئـەوەی کـە هەیشـە نابێتە نەبوو."

– زۆر ڕاستە! بەڵام ئەوان ڕستەیەکی تریان بۆ زیاد کـردووە "لـە دەرەوەی دەسەڵاتی خودا"، بەو واتایەی ئـەو بیـەوێ هـەبوو دەبێتـە نەبوو و نەبووش دەبێتە هەبوو.

کەواتـە یاسـاکان بـەگوێرەی کەسـەکان دەگـۆڕێ. ئـەو خودایـەی یاساکانی داناوە، دەتوانێ بیانگۆڕێ یان بۆ ماوەیەك ڕایان بگرێ.

## بێ ئەوەی یەکێك دروستی بکات،
## پردێك لەخۆیەوە دروست دەبێ؟

– با بێینە سەر ڕووداوێکی ڕاستەقینە، کە ئەم بابەتەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە. وەکو دەزانـن ئیمـامی ئـەعزەم (ئـەبو حەنیفـە) زانایـەکی ئاینیی مەزنە. ئەوانەی لە مەسەلەی پەرستشدا لەسـەر ڕێبـازی ئـەون پێیان دەوتـرێ «حەنـەفی»، بـە واتـای ئـەو کەسـانەی شـوێنکەوتەی «ئەبو حەنیفە»ن. ئەم ئەبو حەنیفەیە تەنانەت ئـەو کاتـەی منـداڵیش بووە، زۆر ژیر و تێگەیشتوو بووە.

جارێکیان کەسێکی بێباوەڕ هاتووەتە بەغدا، کە ئیمام ئەبو حەنیفەش هەر لەوێ ژیاوە. کابرا کەسێکی گەلێك لەخۆ ڕازی بووە... وتوویەتی کێ دەتوانێ بۆمی بسەلمێنێ خودا هەیە؟ ئەوانیش ئیمامی ئەعزەمیان پێ نیشان داوە و پێیان وتووە:

– تەنانەت ئەم زانا بچووکەشمان دەتوانێ بۆتی بسەلمێنێ.

– دە با بۆمی بسەلمێنێ.

مەراقێکی زۆر ئەو ناوەی داگرتووە. کابرای بێباوەڕ چووەتە سەر سەکۆیەکی بەرز و لێی دانیشتووە. لەو سەرەوە سەیری خەڵکیی کردووە و خۆی زۆر بە زانا هاتووەتە بەرچاو.

ئیمامی ئەعزەمیش وتوویەتی: "کتێبەکانم لە ماڵەوەن، با جارێ بچم بیانهێنم". ئەوانیش وتوویانە "باشە".

ئیمامی ئەعزەم چووە و نەهاتووەتەوە. هەموو خەڵکی ئارامییان لەبەر بڕاوە. هەندێکیش پەشیمان بوونەتەوە و وتوویانە:"خۆزگە کەسێکی ترمان ڕووبەڕووی ئەم بێباوەڕە بکردایەتەوە"

کابرای بێباوەڕیش خۆی هەڵکێشاوە و وتوویەتی: "کوا زانا بچووکەکەتان؟ چی لێهات؟".

بەمە زۆر ئازاری داون. بەڵام هەمووشیان پێیان وا بووە ئەم ماستە موویەکی تێدایە. چونکە زانیویانە ئیمامی ئەعزەم کوڕێکی

باشــه، نــازانێ درۆ چــییه و لەســەر قســەی خــۆی دەمێنــێ. ئەگــەر نەیویستایە بێتەوە دەیوت نایەمەوە، یان دواتر خەبەرێکی دەنارد.

بــەم جــۆرە دوای تێپــەڕ بــوونی ماوەیــەکی دوور و درێــژ، زاتــا بچکۆلەکە بەدیار کەوتووەتەوە. حەشاماتەکە خەیاڵی تــەخت بــووە و غەڵبەغەڵبی تێکەوتووە. هەرچی کابرای بێباوەڕیشە، هەر وای نیشان داوە گەلێك متمانەی بە خۆی هەیە، لە ئیمامی پرسیوە:

– ئەرێ چیت لێهات؟ وا بزانم ترسایت لەوەی نەتوانی بوونی خودا بسەلمێنیت؟

ئیمــامی ئــەعزەمیش زۆر بەســانایی و خــوێن ســاردییەوە وەڵامــی داوەتەوە:

– نەخێر، وەها ترسێکم نییە! چونکە سەلماندنی بوونی خودا زۆر لەوە ئاسانترە، پیاو لێی بترسێ. هۆیــەکی تــر هــەبوو بــۆ دواکــەوتنم. ماڵمان لەوبەرە، وەك دەزانی ڕووبارێکی گەورە بە ناو شــاری بەغــدادا تێدەپەڕێ. هەر کە پەڕیمەوە ئەوبەر، زریان و لافاوێکی گــەورە هــەڵی کرد، نە پرد ما نە بەلەم، تا پێی بگەڕێمەوە...

– ئەی چۆن هاتیتەوە؟

– منیش دەمەوێ ئەوەت بۆ باس بکەم. هاتمە سەر ئاوەکە، ئەوەندەم زانی بینیم وا بەردی گەورە گەورە لە کەنار ئاوەکەوە غلۆر دەبنەوە نێو ئاوەکە. هەر بەردە و دەکەوتە سەر ئەوی تر، تا ئەوە بوو پایەکانی پردەکە دروست بوون. ئینجا تەختە داری درێژ درێژ بە ئاسماندا کەوتنە فڕین، نیشتنەوە و لەسەر پایەکان ڕاخران. دوای ئەوەش بزمار وەك گوللە فشکەیان دەهات و تەختەکانیان لێك قایم کرد. خۆڵی ژێر پێشم خزی و سەر تەختەکانی داپۆشی. پردێکی گەورە دروست بوو و ڕێیەکی بێ کێشە و گەورە کرایەوە. منیش بەسەریدا پەڕیمەوە و هاتمەوە.



● ئەو پردە کە بە ئەندازەیەکی ئاوا ورد دروست کراوە، دەکرێ بانگەشەی ئەوەی بۆ بکرێت هەر لەخۆوە دروست بووە؟ ئەی گەردوون چی؟!

هەموویان بە داخ و سەرسوڕمانەوە گوێیان لەو قسانە گرتووە.

کابرای بێباوەڕیش ئەوەندەی تر کەیفخۆشیی گرتوویەتی و وتوویەتی:

– دەڵێی بە ناوی زانای گچکەوە منداڵێکی گەمژەتان بەرەو ڕوو کردوومەتەوە. من دەرفەتی ئەوەم نییە گوێ لەم قسە هەڵەق و مەلەقانە بگرم.

ئیمامیش سەیرێکی کابرای کردووە و وتوویەتی:

– کوێی ئەو قسانەی کردم هەڵەق و مەلەقە؟

– کوێی؟! وا بەوپەڕی شێلگیرییەوە ئەوەم بۆ باس دەکەیت کە پردێك هەر لە خۆڕا، بێئەوەی کەس پێیەوە خەریك بێت و کاری تێدا بکات، دروست بووە. چۆن پردێك لەخۆیەوە دروست دەبێ؟!

چاوەکانی ئیمامیش لە خۆشیا گەشاونەتەوە. بەم وەڵامە کابرای



لای من حاڵی نکووڵیکاران وەك حاڵی ئەو مێشە وایە کە لە کاتی فڕیندا بەر جامێك دەکەوێت، ناتوانێت ئەنجامێکی مەنتیقی لە نێوان هەستی بەرکەوتن و بینینیدا دروست بکات. بۆیە بە سەعات هەوڵ دەدات ئەو جامە تێبپەڕێنێ کە هاتووەتە پێشی.



دەمکوت کردووە و خەڵکەکەش هەناسەیەکی قووڵی کامەرانییان هەڵمژیوە:

- باشە پردێك پڕهونەر و گەورەترە یان ئەم زەمینە؟

- جا ئەوە هیچ گومانێکی تێدا هەیە کە زەمین گەورەتر و پڕهونەرترە؟!

- باشە کە دەڵێی پردێك، کە گەلێك لە زەمین بچووکتر و سادەترە، لەخۆیەوە دروست نابێ، ئەی چۆن دەڵێی ئەم زەمینە پان و پۆڕە لەخۆیەوە دروست بووە؟! کە دەڵێیت ئەم پردە کەسێك دروستی کردووە و بێوەستا نابێ، ڕاست دەکەیت، بەڵام ئایا ئەم زەمینەش پێویست ناکات کەسێك هەبێت دروستی کردبێت؟

کابرا ئەوەی زەوق بێ نەیماوە، سوور بووەتەوە و قوڕگی گیراوە. هەوڵی داوە پێبکەنێ، بەڵام پێکەنینەکەی زۆر خەماوییانە دەرچووە، لە بێچاری و پەشیمانیدا وتوویەتی:

- قبووڵمە کە ئەم زەوییە لەخۆیەوە دروست نەبووە و خالقێکی هەیە.

ئیمامی ئەعزەمیش وتوویەتی:

- ئەو خالقەش خودایە...

## بۆ ناتوانین خودا ببینین؟

بەڵام کابرای بێباوەڕ هەر وازی نەهێناوە، وتوویەتی:

– باشە، پرسیارێکی ترم هەیە، دەبێ وەڵامی ئەمەش بدەیتەوە تا بەتەواوی باوەڕ بە خودا بێنم.

ئیمامی ئەعزەمیش بە تەرزێکی زۆر چاونەترسانە و خەیاڵ ئاسودەییەوە وتوویەتی:

– دەی بپرسە.

بێباوەڕەکەش بە مۆڕاڵێکی شێواوەوە ئەم پرسیارەی کردووە:

– باشە ئەگەر خودا هەیە، بۆچی نایبینین؟

ئیمامی ئەعزەمیش وەك ئەوەی پرسیارەکەی زۆر پێ ئاسان بێ، بزەیەکی کردووە و وتوویەتی:

– با سەرەتا یەکی کوپێك شیرمان بدەنێ، تا وتووێژەکەمان خۆشتر بێت.

کابراش دەمی خۆی لێساوەتەوە و وتوویەتی:

– زۆر باشە، هەم دەخۆینەوە و هەمیش قسە دەکەین.

شیریان هێناوە. ئەو کات دۆشاویان دەکردە ناو شیر بۆ شیرین کردن، چونکە ئەو کات ئەو شەکرەی ئێستا هەیە، نەبووە. کابرا شیرەکەی تێکداوە و کەوتووەتە خواردنەوەی. ئیمامی ئەعزەم

کەوچـکێکی تـر دۆشـاوی داوەتـە کـابرا و پێـی وتـووە: "شـیرەکەت شیرین بکە". کابراش وتوویەتی: "سوپاس، تێمکـردووە. تـۆ وەڵامـی پرسیارەکەم بدەوە".

ئیمامی ئەعزەمیش وتوویەتی "با جارێك مەسـەلەی دۆشـاوەکە (بـە گوزارشتی ئەمڕۆ شەکرەکە) حەل بکەین ئینجا..."

کـابراش بــە تووڕەییەکــەوە وتوویەتی:

– ئــەری نــەموت هــی مــن دۆشاوی تێدایە؟!

ئیمامی ئەعزەم وتوویەتی:

– باوەڕ ناکەم.

کابراش زۆر بەتووڕەییـەوە لێی پرسیوە:

– ئەری بۆ باوەڕ ناکەیت؟



● ناتوانیت ئـەو شـەکر و چەورییەی تـام دەبەخشـنە شـیر ببینیـت، بـەڵام دەتوانی بە زمان پەییان پێببەیت.

ئەویش لە وەڵامدا وتوویەتی:

– چـونکە مـن شـتێك نـەبینم، بـاوەڕی پێناکـەم. ئەگـەر ئـەو دۆشاوەی بـە قسـەی خـۆت تێتکـردووە، پێمـی نیشـان بـدەی بـاوەڕ دەکەم، ئەگەر نا باوەڕ ناکەم...

کابراش سەری باداوە، وەك ئەوەی بڵێ چۆن تووشی داوی خۆم بووم، ئەڕاندوویەتی:

– ئەرێ دۆشاوێك تێکەڵی شیر کرابێت، چۆن دەبینرێت؟ ناتوانم پێتی نیشان بدەم. بەڵام ئەگەر تامی بکەیت دەزانی. ئەگەر زۆرت مەراقە، دەتوانی لە جیاتی چاو بە زمانت هەست بە تامەکەی بکەیت. ئینجا ئەمە کەی مەسەلەیە خۆتت پێوە خەریك کردووە، دە تۆ وەڵامی پرسیارەکەی من بدەوە...

ئیمامی ئەعزەم لە خۆشیا بزەی هاتووەتێ و وتوویەتی:

– ئەتهێشت من وەڵامت بدەمەوە، خۆت وەڵامی خۆت دایەوە.

– چۆن؟

– وەك چۆن دۆشاوی ناو شیر نابینرێت، ئاواش خودا هەیە، بەڵام ناتوانین بەم چاوانەمان بیبینین. ناتوانیت چەوری ناو ئەو شیرەی دەیخۆیتەوە پێمی نیشان بدەیت، بەڵام خۆ شیر چەوریی تێدایە، ئەویش هەر بە تامکردن دەزانین هەیە، نەك بە چاو. ئەمە ئەوە دەگەیەنێت زۆر شت لەم دونیایەدا هەیە ئێمە بە چاو نایانبینین، بەڵام بەو هۆکارانەی دروستی کردوون یان بە شوێنەوارەکانیان دەرکیان پێدەکەین، یان ئەوەتا بە ئەندامێکی تری هەست کردنمان بوونیانمان بۆ دەربکەوێت. تۆ لە کاتێکدا شیرینی و چەوری ناو

شیریش نابینیت، دێیت و دەتەوێ خودا ببینیت. ئەم چاوانەمان توانایان سنووردارە و ناتوانن هەموو شتێك ببینن.

هەر وەك ئەمە، ئێمە بەم چاوانەمان خودا لەم دونیایەدا نابینین، بەڵام مەخلووقەکانی و جێدەستەکانی دەبینین، لەو کاریگەرییانەی دروستی کردوون، تێ دەگەین. بەڵام ئەم کارانە لە ڕێی چاوی مێشکەوە دێنە جێ، نەك چاوی سەر...

کابرا بە حاڵێکی کەمێك شپرزەترەوە و لەنێو داخ و سەرسوڕمانەوە کەوتووەتە بارێکی واوە نەزانێ چ بکات. کەوتووەتە بیر کردنەوە:

– باشە، پرسیارێکی تر... ئەگەر وەڵامی ئەمەش بدەیتەوە باوەڕ بە خودا دەهێنم و موسوڵمان دەبم...

ئیمامی ئەعزەمیش لە خۆشیی ئەوەی خەریکە لە ئامانجەکەی نزیك دەبێتەوە، وتوویەتی:

– دەی بپرسە...

کابراش وەك دوا تەقەڵلا وتوویەتی:

– باشە! قبووڵمە کە خودا هەیە و لەوەش گەیشتین بۆچی نایبینین. بەڵام ئایا ئەو خودایەی بە چاو نایبینین بەڵام بە مێشك دەزانین هەیە، ئێستا خەریکی چییە؟

ئیمامیش وتوویەتی:

- ئەم پرسیارەشت گەلێك ئاسانە، وەلێ گەرەكمە لەسەر ئەو سەكۆیەی های لەسەری وەڵامت بدەمەوە. دەتوانی داببەزیت؟

كابراش بە واق ورِمانەوە دابەزیوەتە خوارەوە. ئیمامی ئەعزەمیش هەڵساوە و چووەتە سەر سەكۆكە، چاوێكی بە دەورووبەرەكەدا گێڕاوە، سەیرێكی خەڵكەكە و پیاوەكەی كردووە و وتوویەتی:

- ئێستا خودا بێباوەڕێكی وەك تۆی لەسەر ئەم سەكۆیە داگرتە خوارەوە و مندالێكی باوەڕداری وەك منی لە جێی دانیشاند.

دەزانم ئێستا دەتانەوێ بپرسن ئاكامەكەی بە چی گەیشتووە. بێگومان وەك ئەوەی هەمووتان پێشبینیی دەكەن، كابرا ناچار بووە موسوڵمان ببێ.

***

كە بەم جۆرە وانەیەكی تر بەكۆتا هات، لە ڕووخساری هەموویاندا خۆشەویستیی ئیمامی ئەعزەم ڕەنگی دەدایەوە و هەمووان لە زەنگ لێدانەكە قەڵس بوون.

## ئایا دەکرێ هەر شتێکمان نەبینی باوەڕی پێنەکەین؟

بڕیار بوو لە وانەی دواتر باسی ئەوە بکەین کە ئایا ڕێککەوت (تەسادوف) دروستکەرە یان نا؟ بەڵام لە وانەی پێشووتر داوام لێکردبوون لێکۆڵینەوە لە بابەتی دەرسەکەدا بکەن، بۆ ئەوەی ببێتە دووبارە کردنەوەیەك تا باشتر بابەتەکە هەرس بکەن، لەگەڵ ئەوەشدا مەبەستم بوو بەرەو فێر بوونی لێکۆڵینەوە ئاڕاستەیان بکەم.



یەکەم قوتابی کە دەستی هەڵبڕی، دەیویست باسی ئەوە بکات بۆچی خودا نابینین، ئەمانەی وت:

– چیی دی لە ڕۆژگاری ئەمڕۆماندا دەستەواژەی: "ئەوەی نەیبینم باوەڕی پێناکەم" نایخوا، هەر وەك لەگەڵ زانستیشدا یەك ناگرێتەوە، چونکە ئێستا ئەوە بەتەواوی ڕوون بووەتەوە کە گەلێك شت هەیە لەم دونیایەدا نایبینین. بۆ نموونە هەوا... هەوا کە هەردەم بۆ ئەوەی بژین پێویستمان پێیەتی، لە هەموو شوێنێکدا هەیە، کەچی ناشیبینین. خۆ بێ ئەویش ناتوانین بژین.

پرسیم:

- ئێستا هەمووتان هەواتان لە لایە؟
- بەڵێ، چوار دەوری تەنیوین.
- باشە کە نایبینین، ئەی بە چیدا دەزانین هەیە؟
- بەوەی بۆ ناو سییەکانمان هەڵیدەمژین. یان بەوەی لە کاتی دەست جووڵاندندا هەست بە فێنکییەکەی دەکەین.
- کەواتە بۆ ئەوەی بڵێین هەیە، ئیللا مەرج نییە بە چاو بیبینین، دەتوانین بە ئەندامێکی ترمان هەستی پێبکەین، وەك چۆن خودا نابینین، بەڵام بە ڕوانین لە دروستکراوەکانی پێی دەزانین.

***

یەکێکی تر وتی:

- مامۆستا! جارێکیان بێباوەڕێك دەچێتە گوندێك تا خەڵکی گوندەکەش وەك خۆی بێ دین بکات. خەڵکەکە کە دەبینن ئاوا پۆشتە و پەرداخە، لە دەوری جەم دەبن. دوای چاکی و خۆشی، کابرا هەلی دەست دەکەوێت و قسە دەباتە سەر مەسەلەی باوەڕ. هێما بۆ چیایەکی دوور دەکات و لە گوندییەکان دەپرسێت:
- ئەو چیا دوورانە دەبینن؟
- بەڵێ دەیانبینین.
- ڕاست دەکەن دەیانبینن، چونکە ئەو چیایانە هەن.

– باشه ئەو چەمەتان لێدیارە؟

– بەڵێ.

– ئەی ئەو دار سنۆبەرانە؟

لادێییەکان مەراقیان دەکەن دەبێ ئەو قسانە بە کوێ بگەن، ئەم جارەش دەڵێن:

– هەڵبەتە دەیبینین.

– کابرا لە بەدکارییەکەی بەردەوام دەبێت و دەڵێت:

– ڕاست دەکەن، چونکە ئەوانیش هەن.

ئینجا دەڵێت:



– باشە، ئەی خودا دەبینن؟

ئەوانیش دەڵێن:

– نەخێر، نایبینین.

کابراش سەر بادەدات وەك ئەوەی بڵێ: "گرتی"، دەڵێ:

– جا چۆن دەیبینن؟ خۆ ئەو بوونی نییە!...

گوندییەکان دۆش دادەمێنن و دەڵێن:

– تۆبە تۆبە خوایە! چۆن وا دەڵێیت؟

سەیری یەکدی دەکەن و بیر لەوە دەکەنەوە چۆن وەڵامی بدەنەوە. مەلای گوندەکە چەند هەنگاوێك دێتە پێشەوە و دەڵێت:

– خەڵکینە! ئینجا گوێ لە من بگرن. منیش هەندێك پرسیارتان لێدەکەم:

ئێوە ئەم غەریبەیە دەبینن کە هاتووەتە گوندەکەمان؟

– بەڵێ، دەیبینین.

– ئەی چۆن نایبینن؟! چونکە ئەو هەیە. باشە کڵاوەکەی سەری دەبینن؟

– ئەی بۆ نا؟! وا بەسەر سەریەوە.

– بەڵێ ڕاستە دەیبینن، چونکە ئەو کڵاوە هەیە. باشە ئەی ئەقڵی دەبینن؟

– نەخێر، نایبینین...

– بێگومان نایبینن، چونکە ئەقڵی نییە!

دوابەدوای ئەمە لادێییەکان کابرایان بە هاتوهاوار لە لادێکەیان وەدەرناوە و وتوویانە:

– خودا لە مامۆستا ڕازی بێت. خۆ خەریك بوو ئەم بێ دینە مێشکمان تێك بدات...

– ئافەرین بۆ تۆ ڕۆڵە گیان! مانای وایە ئەو کەسەی بە ناوی نەبینینەوە نکوولّی لە بوونی خودا دەکات، دەبێ نکوولّی لە ئەقڵی

خۆیشی بکات، چونکە نایبینێت. نابێ بە هیچ جۆرێك گوێ لەو مرۆڤـە بێ ئەقڵانە بگیرێت.

***

قوتابییەکی تریش وتی:

– ئایا پێویست ناکات ئـەو جـۆرە کەسانە نکوولّی لـە بـوونی ڕۆحیش بکەن و خۆیان بە بێ ڕۆح ئەژمار بکەن؟




• ژمارەی ئـەو تیشکانەی نایانبینین زیاترە لەوانـەی دەیانبینین. ئێمـە لـە پەنجەرەیـەکی بچکۆلانەوە لـە جیهان دەڕوانـین. دێـین ئـەم ڕاستییە زانستییە نادیدە دەگرین و دەڵێین: "هـەر شـتێك نـەبینین، بـاوەڕی پێناکەین، ئەمـە زۆر هەڵەیە."

– ئافەرین ڕۆڵە! بێگومان ئەوەی نکوولّی لە بوونی خودا دەکات، دەبێت لەپاڵ ئەقڵیدا نکوولّی لە ڕۆحیشی بکات. سەیرکەن شاعیرێکی کلاسیکیمان چی دەڵێت:

گەرچی چاو ئەندامی بینینە، بینین
لە دیتنی خۆی دەستەوسانە و نەبین

چاو وەك چۆن زۆر شتی ئەم دونیایە نابینێت، خۆیشی نابینێت. کێ دەتوانێ چاوی، بە چاوی خۆی ببینێت؟ خودا بەوە ڕەحمی کردووە ئاوێنە دروست کراوە، ئەگەر نا چاوی خۆشمان نەدەدیت، وا نییە؟

***

– دەی با بیربکەینەوە، بزانین چیی تر هەیە نایبینین؟

ئۆیا وتی:

– کارەباش یەك لەو شتانەیە کە نایبینین. بەڵام دەتوانین بە ڕووناکیی لە گلۆپدا و بە گەرمیی لە ئوتوودا و بە وزەشی لە پاسی کارەباییدا، پەی پێببەین و ببینین. خۆی چییە و چۆنە، بینینی ئەمە مەحاڵە، بەڵام کە لێمان دەدات، ئینجا دەزانین چییە!

– ئافەرین بۆ ئێوە! ئەوەی ڕاستی بێت دەتوانین گەلێك نموونەی تر بهێنینەوە. با واز لەم باسە بێنین و بێینە سەر ئەوەی کە ئایا دەگونجێ شتێك بەڕێککەوت ببێت. با ئێستا هەندێك بیر لەمە بکەینەوە.



ڕەنگە بێباوەڕێك بڵێت: "تەلەفزیۆن بە چاوی خۆم دەبینم، بۆیە دەزانم هەیە، تا خوداش نەبینم باوەڕی پێناهێنم". کەسێك ئاوا بیری کردەوە، بیبەنە سەر پردی «بۆغازئیچی» (ئەو پردەی هەر دوو بەشەکەی ئەستەنبووڵ بەیەکەوە دەبەستێتەوە – وەرگێڕ) و پاپۆڕێکی پێ نیشان بدەن کە لەو خوارەوە بڕوات و لێی بپرسن:

"کێ ئەو پاپۆڕە لێدەخوڕێت؟" بێگومان دەڵێت: "کاپتنێك". ئێوەش بڵێن: "باشە، تۆ ئەو کاپتنەت لێ دیارە؟! کێ ناڵێ ئەو پاپۆڕە هیچ کاپتنێکی تێدا نییە و هەر لەخۆوە ناڕوات؟". یەکسەر ڕەخنە دەگرێت و دەڵێت: "نە گیانە! سەیرکە چەند بەڕێکی دێت و دەچێت، لە بەندەرەکە لادەدات و سەرنشینەکان دادەگرێت، ئینجا دوور دەکەوێتەوە و بە ئاراستەی بەندەرێکی تر دەڕوات، تووتەتووت دەکات. بەمانەدا دیارە کاپتێك ئاراستەی دەکات". ئەمە بێ ئەوەی کاپتنەکە ببینێت وا دەڵێت، چونکە پێی وایە جوان و ڕێك ڕێ کردنی نیشانەی هەڵسوڕانییەتی لەلایەن کاپتنێکەوە.

ئەوانەی دەیانەوێ بەباشی خودای گەورە ببینن، دەبێ بەجوانی بیر لەم نموونەیە بکەنەوە.

**جەنك گۆرای**

# ئایا بەرێککەوتە؟

- ئایا هیچ شتێك بەرێککەوت دەبێت؟ دەی با بڵێین دەبێ، بەڵام ئایا جوان و رێکوپێك دەردەچێت؟ دەی با بڵێین جارێك و دووان رێك دەرچوو، ئایا رێی تێدەچێ ئەم حاڵە بۆ چەندین جار دووبارە ببێتەوە؟ ئەگەر توانیمان بە "بەڵێ" وەڵامی هەموو ئەم پرسیارانە بدەینەوە، ئەو کات دەتوانین بە بەرێککەوت دروست بوونی دونیاش بڵێین: "بەڵێ". بەڵام ئەگەر نەمانتوانی تا کۆتاییەکەی هەر بڵێین "بەڵێ"، مانای وایە رازی نین بەوەی رێککەوت بەدیهێنەر بێت.

با بە نموونەیەك ئەمەتان بۆ روون بکەمەوە:

با بڵێین من ئەم تەباشیرە دەهاوێژم و لە لووتی قوتابییەکی دوای دواوەی دەدەم. هەڵبەت ئەمە زۆر زۆر زەحمەتە، بەڵام با بڵێین بوو. تەباشیرێکی تری تێدەگرم. ئەوە چییە؟ دیسان لووتی هەمان قوتابیی پێکایەوە. جارێکی تر و جارێکی تر، هەر لە هەمان شوێنی دەدەمەوە. ئەمە بە سەدان جار دووبارە دەبێتەوە و هەر بەر هەمان شوێن دەکەوێتەوە. ئایا دەتوانرێت بەمە بوترێت رێککەوت؟ شتێك ئاوا بە سەدان جار دووبارە ببێتەوە، دەتوانرێ پێی بوترێ رێککەوت؟ ئەگەر نا، ئەی دەبێ چیی پێبڵێین؟

چاودێری پۆل بەتەواوی وەڵامەکەی پێکا:

– مامۆستا! شتی وا بە تەسادوف یان ڕێککەوت دانانرێت. هەر هیچ نەبێ، دەبێ بڵێین تۆ لەو کارە شارەزایت، وەستایت لە تێگرتن و پێکاندا، چونکە هیچ ڕێی تێناچێت ئەو هەموو ڕێککەوتە بەدوای یەکدا بێن. ئەوەی کە پێی دەڵێین ڕێککەوت، وەك هۆکارەکان کەڕ و کوێر و بێمێشکە، بۆیە ناتوانێت کارێکی وا کە پێویستیی بە بینین و زانین هەیە، بۆ چەندین جار بێنێتە جێ. ئەگەر نەشبینین و نەشزانین، هەر دەبێ وا بیربکەینەوە کە یەکێکی بەهەست و زانا هەیە بەمە هەڵدەستێت نەك ڕێککەوت.

– ئافەرین بۆ تۆ، بابەتەکەت زۆر جوان پوخت کردەوە. ئەگەر حەز دەکەن با منیش نوکتەیەکتان بۆ بگێڕمەوە.

– بێگومان حەز دەکەین، مامۆستا!

***

– پیاوێکی نابینا لەسەر ڕێ سواڵی دەکرد. یەکێك لەولاوە هات و زۆر بەتوندی خۆی پێدا کێشا، هێشتا ئەویش هاواری کردە سەری:

– ئەرێ کوێریت؟! ئەوە من چاوم نییە، نابێ تۆ سەیری پێشی خۆت بکەیت؟!...

سواڵکەرە نابیناکە سەیری پێهات:



- چـــی؟! دیـــاره تـــۆش نابینایت...

- بـەڵێ، نابینـام... ئـەوە چـییە، وا دیـــاره خـــۆم لـــە یەکێکی وەك خۆم نابینـا داوە. گەردنم ئازاد بکە. تۆ لـە حـاڵی من نەگەیت، کێ لێی تێ دەگا؟

پێکەوە کەوتنە ڕاز و نیاز. سواڵکەرە نابیناکـە لـەوی تـری پرسـی کە چەندی دەست کەوتووە. ئەویش پێی وت و، تەنانەت پارەکانیشی دەرهێنا تا نیشانی بدات، ڕاستتر بڵێین خەریك بوو دەریبهێنێ، ئـەوی تر، واتە سواڵکەرەکە، کردی بـە کیسـەی پارەکـەدا و بـۆی دەرچوو. وای لێکدایـــەوە کـــابرا کـــوێرە، خـــۆ نـــاتوانێ بـــەدوای بکـــەوێت و بیدۆزێتەوە... بـەڵام وەك ئـەوەی بـۆی چـوو، وا دەرنەچـوو، چـونکە هێشتا ئەوەندە دوور نەکەوتبووەوە، بەردێك دای لە ناوەندی پشـتی. کەمێك خێراتـر ڕای کـرد، بـەڵام بـەردێکی تـر، یـەکێکی تـر، یـەکێکی تر... بەرد وەك ڕێژنەی باران دەیدا لە ناوەندی پشتی.

لە ناچاریدا وەستا، بۆی دەرکەوت ئەو کابرایەی بەدوای کـەوتووە کوێر نییە، پێی وت:

– ئەریٚ، کابرا! ئەوە چییە؟ ئەو بەرد تێگرتنەی تۆ قەت لە هی کوێر ناچێت!

***

کەواتە بەڕێککەوت هەر بەردێکی کە نابینایەك هەڵی بدات، هەمان ئامانج ناپێکیٚ. ئەگەر نا، دەبیٚ ئەوەمان بۆ دەربکەویٚ ئەو کەسەی بەردەکە هەڵدەدات کوێر نییە، کەسێکە بینایە و شارەزایشە لە بەرد تێگرتن. چونکە نابینا وەك ئەوەی ئەم ڕووداوە، ناتوانیٚ بەرد لە گۆشەی (نەوەت) بدات.

کاتێك بیر لە گەردوون و ئەم سەرزەمینە دەکەینەوە کە لەسەری دەژیین، ڕێکوپێکی و ئەندازەگیرییەکی وا دەبینین کە ملیۆنان ساڵە لە دووبارە بوونەوەدایە و هێشتاش هەر بەجوانی و ڕێکی وەستاوە، ئەمە هیچ ڕێی تێناچیٚ بە «ڕێککەوت» بووبیٚ. با چەند نموونەیەکتان بۆ بێنمەوە:

١– ئەگەر بەرگەهەوا (ئەتمۆسفێر)ی زەوی، چەند پیٚ (قەدەم)ێك لەمەی ئێستای ئەستوورتر بووایە، دوانە ئۆکسیدی کاربۆن ئۆکسجینی هەڵدەمژی، بەمەش زیندەوەرانی سەر زەوی ژیانیان لەدەست دەدا.

٢– ئەگەر ئەو بەرگەهەوایە کەمێك لەمەی ئێستای تەنکتر بوایە، ئەو ئەستێرەکشان (نەیزەك)انەی لە دەرەوە دێن، بەر هەموو لایەکی

زەوی دەکـەوتن و هـەر شـتێك هـی سـووتان بوایـە دەیانسـووتاند و دەیانکرد بە خۆڵەمێش.

٣- ئەگـەر تینـی تیشـکی خـۆر نیـوەی ئەمـەی ئێسـتا بووایـە، دەمانبەسـت. ئەگـەر بەپێچەوانەشـەوە دوو ئەوەنـدە بووایـە، دەسووتاین و دەبووین بە سووتماك.

٤- ئەگەر مانگ بیست هەزار میل نزیکتر بوایە، بـە هـۆی هەڵکشـان و داکشانی دەریاکان لە شەواندا، هـەموو ڕووی زەوی بـە چیاکانیشـەوە ژێر ئاو دەکەوتن.



٥- ئەگەر شەو دە قاتی ئەمەی ئێستای درێژ بوایە، خۆر بە ڕۆژ دەغڵ و دانەکانمانی دەبرژاند و، سەرمای شەوانیش دەیکردن بە سەهۆڵ.

٦- ئەگە ڕێژەی ئۆکسجین لە هەوادا لەبڕی ٢٠٪، ٥٠٪ یان زیاتر بووایە، بە لێدانی یەك برووسکە، هەرچی هەیە دەبوو بە خۆڵەمێش. ئەو کاتیش ئەگەر یەك چڵەدار گڕی بگرتایە، ئاگرەکە هەر هەموو دارستانەکانی دەگرتەوە.

٧- باران نەبوایە، سەر ڕووی زەوی دەبووە بیابانێکی وشك و برینگی بێ ژیان. با و دەریا و زەریاکان نەبوونایە ژیان شوێنەوارێکی نەدەما. ئاو لە خوێ جیا نەبوایەوە و هەر لەگەڵیدا ببوایە بە هەڵم، ژیان نەدەبوو. هەڵمیش لە هەوا سووکتر نەبوایە، دیسانەوە ژیان نەدەبوو.

٨- زەریاکان ئاویان شیرین بووایە، دەگەنین و بۆنیان دەکرد، بە هۆی ئەم بۆن کردنەشەوە ژیان لەسەر زەوی نەدەما. چونکە خوێ ڕێ لە بۆگەن بوون و بۆن کردن دەگرێت. (کلۆر)یش لەگەڵ (سۆدیۆم) یەکی نەگرتایە، خوێ نەدەبوو و بەم هۆیەشەوە ژیان نەدەبوو.

٩- تەوەرەی زەوی لەجیاتی ئەوەی وەك ئێستا ٢٣ پلە لارە، ڕاست بوایە و جووڵەی نەبوایە، ئەو هەڵمەی لە دەریا و زەریاکانەوە بەرزدەبووەوە و دەبووە باران، تەنها دادەبارییە سەر هەر دوو

ناوچـەی بـاكوور و باشـوور، چـینی سـەهۆڵبەندان دروسـت دەبـوو و دواییـی نـەدەهات. لـە ئەنجامیشـدا ئـادەمزاد و زینـدەوەران لـەناو دەچوون و ژیان نەدەما.

١٠- ئەگەر زەوی وەك «عەتارد» بوایە، تـەنها لایـەكی ڕووی لـە خـۆر دەبوو. لە میانەی خولانەوەی بـە دەوری خـۆردا تـەنها یـەك جـار بـە دەوری خۆیـدا دەخولایـەوە. بـە گوزارشـتێكی تـر لـە لایـەكی زەوی بەردەوام شەو و لە لاكەی تریش بـەردەوام ڕۆژ دەبـوو. بەمـەش هـیچ كەسێك نەیدەتوانی بەدرێژاییی ئەو شـەوە یـان ڕۆژە درێـژە بـە ژیـان بدات. بەم جۆرەش ژیان نەدەما.

١١- یاسـای كـێش كـردن نەبوایـە، گەردیلـە و بەشـەكانی لـە كـوێ دەبـوون؟ لـە كـوێ خـۆر خـۆر و زەوی زەوی دەبـوو؟ خـۆ ئەگـەر بشـبوونایە، چـۆن لـەم شـوێنەی ئێسـتایان دەوەسـتان؟ لـە شـوێنی خۆیشیان بوەستانایە، چۆن لەسەر زەویدا ژیان دەبوو و مرۆڤ چۆن دەیتوانی بجووڵێتەوە و ڕێ بكات؟

١٢- خۆ ئەگەر یاسای كێش كردنیش هەبوایـە، بـەڵام زەوی هێنـدەی مـانگ بچـووك بوایـە یـان هێنـدەی چـواریەكی ئێسـتای بوایـە، بەرگەهەواكـەی و پارێزگـاریی دەریاكـانی لەبـەین دەچـوون و پلـەی گەرما دەگەیشتە ئەو ئاستەی گڕ لە هەموو شتێك بەربێ.

١٢- ئەگەر (ئەلیکترۆن) و (پرۆتـۆن)ەکـان بەیەکـەوە لکـاو بوونایـە، زەوی هێندەی هێلکەیەك دەبوو، ئەو کات مرۆڤ و زیندەوەرەکانی تر نەدەبوون.



١٤- ئەگـەر توخمـەکان پێکـەوە نەسازانایە و پێکـەوە کارلێکیـان نەکردایە، نە خۆڵ نە ئـاو نـە دار نــە ئــاژەڵ و نــە ڕووەکــیش نەدەبوون...

١٥- ئەگــەر یاســای گــەرمیی نەبوایە، زەوی سارد نەدەبووەوە و نەدەچووە دۆخێکەوە بـە کـەڵکی ژیان بێت.

ئێوەش بیربکەنەوە. دەتوانرێ سەدان هـەزار خـاڵی لـەم چەشـنە ڕیز بکرێت. کەواتە بۆ ئەوەی لەسـەر زەوی ژیـانێکی وەك هـی ئـەمرۆ ڕێکوپێـك و ئاسـایی ببرێتـە سـەر، پێویسـت بـووە ئـەم هـەموو بـارە بێشومارە هەبن. هەر بە هۆی ئەم بارو هەلومەرجە بێشـومارانەیە کـە هەزاران ساڵە ژیان درێژەی هەیە. ئایا گردبوونەوەی هەموو ئەمانە بە ڕێکترین شـێوە، ڕێککەوتـە؟ ئـەم هـەموو خاڵـە دۆش دامێنـەرە، هـی ئەوەن هەر لەخۆڕا بووبن؟

کەسێك بڵێ سادەترین نیگار و بچووکترین مێز بەڕێککەوت دروست نابن، بۆی هەیە ڕووداوەکانی سەرزەمین و گەردوون بەڕێککەوت لێك بداتەوە ؟!

ئەمانە زۆر بەئاسانی ئێمە بەرەو ئەو ڕاستییە دەبەن کە ڕێککەوتیش خولقێنەر نییە.

## ڤیتامینەکان ڕێ هەڵە ناکەن

- بۆ ئەوەی لەوە بگەین کە کردەوەیەکی مەنتیقی و بێ کەموکوڕیی بەڕێککەوت نابێ، جەستەی خۆیشمان ڕێنموونیمان دەکات. ئەندامەکانی جەستەمان کە لە جوانترین شێوەدان و لە شیاوترین شوێندان، ئایا دەشێ بەڕێککەوت وا بن؟ سەرمان و، چاو و گوێ و دەم و لووتمان کە بە جوانترین شێوە تێیدا جێ کراونەتەوە، دەشێ شوێنکاری ڕێککەوت بن؟

ئایا ڕێککەوتە وای کردووە هەر دوو چاوەکە هەمان قەبارەیان هەبێ؟ یان ئەوەی لووت ڕێك کەوتووەتە ناوەڕاستی دەموچاوەوە؟ ئەی گوێچکەکان، کە وەرگری دەنگن و بە هەمان قەبارەوە لە هەردوو لای سەر قایم کراون؟ ئەو ڕێکخستنە ڕێك و جوانەی ددانەکان لەناو دەمدا بەڕێککەوت بووە؟

ئینجا ئەگەر بەڕێککەوتیش بێ، چۆن ئەو ڕێککەوتە لە هەموو مرۆڤەکاندا ملیاران جار دووبارە دەبێتەوە؟ ڕێککەوتی نابینا، چۆن هەر بەردێ بیهاوێژێ، لە گۆشەی نەوەتی دەدات؟

دەکرێ ئەم پرسیارانە لە گۆشەنیگای جیاجیاوە ملیۆنان جار بپرسرێن. بەڵام با شتێکتان لێبپرسم.

تەنانەت پۆستەچییە زۆر زیت و زرینگەکانیش، هەندێ جار ناونیشانی سەر نامەکانیان لێتێکدەچێ و نامەکان بۆ ناونیشانی هەڵە دەبەن. کەچی موولوولەکانی خوێن لە جەستەماندا، ڤیتامینەکان بۆ شوێنی دیاریکراوی خۆیان دەبەن، خۆ هۆشیشیان نییە و ڤیتامینەکانیش ناونیشانیان لەسەر نەنووسراوە!

بۆ جارێکیش بێ بیربکەنەوە، ئەگەر ڤیتامینێک لە میانەی گوازرانەوەیدا بەهەڵە و زیاد لە پێویست بۆ شوێنێك بچووایە، چ ئاڵۆزی و ناڕێکییەك لە لاشەماندا دەهاتە ئاراوە، بۆ نموونە بیر لەوە بکەنەوە، ددانێکتان زیاد لە پێویست خۆراکی بۆ چووە و بەم هۆیەشەوە زیاد گەشەی کردووە. ددانێکی سەیری وا کە لەناو دەمدا جێی نەدەبووەوە، چیی بە مرۆڤ دەکرد؟!

– مامۆستا! خۆ دەمانتوانی ئەو ددانەمان هەڵبکێشین و ڕزگارمان بێ لەدەستی.

- ڕاست دەکەیت، عەلی! بەڵام ئەی ئەگەر گوێمان وابوایە، ئەو کات چیمان دەکرد؟ بیر لەوە بکەنەوە، ئەگەر یەکێکیان یان هەردووکیان نیو مەتر بوونایە و بلەنگایانەوە.

قوتابییەکان بە سەرسوڕمانێکی زۆرەوە لەیەکتریان دەڕوانی و هەندێکیان گوێیان و هەندێکیان لووتیان دەگرت، وەك ئەوەی یەکەم جاریان بێ پەی بەو ئەندامانەیان ببەن.

قوتابییەکان هێشتا لە سەرنجداندا بوون، ویستم نموونەیەکی تر لەسەر ڕێککەوت بهێنمەوە و باسەکە بەکۆتا بێنم:

- ئێستا ئێوە بڵێن بزانم، ئایا کارێکی مەنتیقی و مانادار و ڕێکوپێك بەڕێککەوت دێتە ئاراوە؟



- نەخێر، نایات...

- کەواتە مادام ڕێککەوت کەڕ و کوێر و بێهەستە، ئەو کالا و بوونەوەرەی دەشیهێنێتە ئاراوە، دەبێ بێمانا و نابووت و بێسەروبەر بێ، وا نییە؟ باشە لەم جیهانەدا، لە سروشت و ئادەمزاددا، هیچ شتێکی نارێك و بێمانا هەیە؟

هەموو پۆل بە یەك دەنگ هەمان وەڵامیان دایەوە:

- نەخێر، نییە.

## ئایا شتێکی ناڕێك و بێ بنەما
## لە گەردووندا هەیە؟

وا دیار بوو یەك لە قوتابییەکان ڕەخنەی هەبوو لەم "نەخێر نییە" دەستەجەمییە. دەستێك بەرز بووبووەوە، ئەو قوتابییە وتی:

– بەڵام مامۆستا! من وەك بڵێی پەی بە جۆرێك لە ناڕێکی و تێکەڵ و پێکەڵی دەبەم.

– دەشێ لای تۆ وا بێ، دەکرێ هەر شتێك بە ناڕێك و نابووت ببینی، وەلێ با شیی بکەینەوە، بزانین ئایا بەڕاستی وایە؟ هەندێ جار ئەوەی مێشکی ئێمە بە بێجێ و بێمانای دادەنێت، لە ڕاستیدا زۆریش جوان و مانادار و سوودبەخشە. چییە ئەوانەی تۆ لات وان تێکەڵ و پێکەڵ و بێمانان؟ دەتوانی نموونەیەکم بدەیتێ؟

– مامۆستا! بۆ نموونە باران... شوێن و کاتی بێ و نەبێ دەبارێ... شەقامەکان دەکات بە قوڕاو و سێڵاو... ئەمە جگە لەوەی گەلێك کەسیش بەهۆیەوە نەخۆش دەکەون.

– ئازیزەکانم! سەرەتا با بزانین ئێوە لە بەرانبەر نموونەکەی هاوڕێکەتان چی دەڵێن؟

قوتابییەکان زۆربەیان دەستیان بەرز کردبووەوە.

– بەڵێ، چاودێر! بێژە بزانم...



● له بارینی باراندا، هەزاران کەڵك و حیکمەت هەیە. تەڕ بوون و نەخۆش کەوتنی ئێمە پێی، خراپیی ناگەیەنێت.

– مامۆستا! باران گەلێك بەکەڵکە. ئەگەر نەبارێ بێ ئاو دەبین، ڕووەك و ئاژەڵان زەرەرمەند دەبن. باران ئەوەندە سوودی هەیە، باوباپیرانمان ناویان ناوە «ڕەحمەت». ماوەیەك دانەبارێ، جووتیاران دەردەچنە دەشتەوە و نوێژە بارانە دەکەن و نزای بارینی دەکەن.

– باشە، ئەی زیانی چییە؟

– هەندێ جار زیانی دەبێ. بەڵام ئەمە سووچی ئەو نییە، بەڵکو هی ئەو کەسەیە کە ڕێوشوێنێکی وەهای نەگرتووەتەبەر کە ڕێ لە زیانەکانی بگرێ. مرۆڤ لەسەریەتی جلوبەرگی زستانەی بۆ بپۆشێ و

چەتر هەڵدا، کاری نەبێ دەرنەچێتە دەرەوە و خۆی نەخاتە بەر باران... هتد.

– ئافەرین! پێم وایە بەتەواوی ڕوون کرایەوە.

بەڵام ئەو قوتابییەی پرسیارەی کرد، هێشتا بەرگریی دەکرد.

– مامۆستا! بەڵام خەڵکی هەژاریش هەیە، دەبێت بیر لەوانیش بکەینەوە. بەڕاست، ئەی بوونی هەژارانیش نیشانەی نارێکی و بێمانایی نییە؟

– نەخێر، ڕۆڵە گیان! بوونی هەژار و نەداریش لە کۆمەڵدا نیشانەی نارێکی و بێمانایی نییە. چونکە بۆ ئەوەی جڤاك بتوانێ بە شێوەیەکی ڕێکوپێك بژی، دەبێ لە هەموو ئاست و چینێکدا مرۆڤ هەبێت. گەر لە کۆمەڵگایەکدا گشت تاکەکان دەوڵەمەند بن، ژیان دەچێتە سەر؟ ئەگەر وا بێ، ئەی کێ زبڵ کۆ دەکاتەوە؟ کێ لە کارگەدا کرێکاری دەکات؟ کێ دەبێتە پۆلیس و پاسەوان؟ چەندین کاری وەك ئەمانە، کە پێویستن بۆ ژیانی کۆمەڵ، کەس نایکات. ئەو کۆمەڵگە ئاسوودەیە کە هەموان یارمەتیی یەکتری بدەن و وەك مرۆڤ مامەڵە لەگەڵ یەکدا بکەن، نەك ئەوەی کە هەمووی دەوڵەمەندە. خوداش ئەوەمان لێدەخوازێ کە کۆمەڵگەیەکی ئاوا ئاسوودە بێنینە ئاراوە. بڕوانن، ئایا پێنج قامکەکەی دەستمان چوونیەکن؟ بەڵام خۆ پێویستمان بە هەموشیان هەیە، بۆ؟ چونکە

هەر یەکەیان پێویستیی بەوانی دیکە هەیە و بەتەنێ هیچی پێناکرێت. بە هەماهەنگییان هەموو شتێکیان پێدەکرێ و دەست پێکدەهێنن. ئێمەش لەسەرمانە کۆمەڵگایەکی ئاوا یەکگرتوو و هەماهەنگ پێک بهێنین، تا ببین بە میللەتێکی خاوەن هێز. خۆی لە خۆیدا لە هەموو ئەوانەی خودا بەدیی هێناوە، لە هەموو ئەو ڕێکخستنانەی هێناونییەتە جێ، جوانی و پێکانێکی لە ڕاددە بەدەر هەیە. جوانییەکی وا، کە لەوە جوانتر نابێ... بیرێك لە جەستەی مرۆڤ بکەنەوە، ئایا لەوە جوانتر دەبێ؟ دەی با وا دابنێین دەتوانین شوێن و شێوەی ئەندامەکانی لەشمان بگۆڕین، چۆن بووایە ڕێك و جوانتر دەبوو؟

زۆر خۆیان هێنا و برد، نەگەیشتنە شێوازێکی لەبارتر بۆ ڕێکخستنی جەستەی مرۆڤ؟ کە قسەکان درێژەیان کێشا، محەمەدی فەیلەسووف وەڕس بوو:

– مامۆستا! ئەوە ڕوون و ئاشکرایە کە ئەگەر چل ساڵی تریش بیربکەینەوە، ناگەینە شکڵ و شێوەیەکی ڕێکتر لەوەی خودا دایناوە، بۆیە با زیاتر کات بەفیڕۆ نەدەین، تا جەنابتان بتوانن نموونەی زیاترمان بۆ بێننەوە.

– باشه، محەمەد! پێم وایە پۆلەکەش لەگەڵ تۆدا هاوڕایە. با بەسەرهاتێکی پڕ پەند و ئامۆژگاریی مەلای مەشهوورتان بۆ بگێڕمەوە:



## کولەکە لە جێی گوێز بووایە

ڕۆژێکیان مەلای مەشهوور لە مەزراکەیدا خەریکی کار کردن بوو. شەکەت ببوو، بۆ ئەوەی تاوێك پشوو بدات لە بن دارگوێزێك لێی ڕاکشا. لەناو ئەو گەرمای هاوینە لە ژێر سێبەری پەلوپۆی ئەو دارە، فێنکی بووەوە و کەوتە بیرکردنەوە. بینی وا کەمێك لەولاوە کولەکەی زەردی زل زل لە لقی باریکەلانەوە دەرچوون و لەو سەر ئەرزە لێی ڕاکشاون، کەچی ئەو درەختە بە هەیبەتەی لە ژێرییەوە ڕاکشاوە، گوێزی بچووك بچووکی دەرکردووە.

وتی:

– ئەی پەروەردگاری مەزن! هەرچی تۆ کردووتە جوان و بەجێ و پڕ حیکمەتە، بەڵام ئەقڵم ئەمەیان ناگرێ. گوێزی بچووکت لە داری گەورە و کولەکەی گەورەشت لە دەوەنی بچووک خەلق کردووە. باشە ئەگەر ئەو کولەکانەت لەم دارە و گوێزەکانیشت لەو دەوەنە بچووکانە بخولقاندایە، چاکتر نەبوو؟



بۆ لەو کاتە گوێزێک لە دارەکە نابێتەوە و لووتی مەلا ناپێکێ؟!...

دەستی بە لووتییەوە گرت و هەڵسایە سەر پێ، دەستەکانی بەرز کردەوە و وتی:

– ئەی خودای گەورە! تۆ چیت کردبێ، جوانە و لە جێی خۆیەتی. ئەگەر کولەکەیەک لە جێی ئەو گوێزە بووایە کە کەوتە سەر لووتم، حاڵم چۆن دەبوو؟! بەڵێن بێ جارێکی تر دەست لە کاروباری تۆ وەرنەدەم. شتێک ئەقڵم وەری نەگرت، لووتمی تێنەژەنم. خودایە گیان بمبەخشە!

***

– کەواتە ئەو شتانەی ئێمە بە بێمانا و نابووت دەیانبینین، لە بنەڕەتدا جوان و پڕ مانان. ئێمە لەبەر ئەوە دەخەڵەتێین کە لە گۆشەنیگای بچووکەوە دەڕوانین و بە ئەقڵی خۆمان لێکدانەوە بۆ شتەکان دەکەین. خۆ ئەگەر لە گۆشەنیگای فراوانتر و لە چەند لایەکەوە سەیری بوونەوەرەکان یان ڕووداوەکان بکەین، بۆمان دەردەکەوێت کە زۆر بە جوانی و لە جێی خۆیاندا خولقێنراون. ئەو کاتیش هاودەنگ لەگەڵ (ئیبراهیم حەققی ئەرزەڕۆمی) دەڵێین:

وەڵلاهـــی جـــوان کردوویـــە
بیللاهـــی جـــوان کردوویـــە
ببینـــە خـــوا چـــیی کـــردووە
خەللاقـــە، جـــوان کردوویـــە..

***

## ئەو ناوەی گیاکان نووسییان

(بیتی) کە یەکێکە لە فەیلەسووفە بەناوبانگەکانی سکۆتلەندا، بەم جۆرە ئەوەی بۆ منداڵەکەی سەلماند کە مرۆڤ بەڕێککەوت دروست نەبووە و تەنها و تەنها لەلایەن خوداوە خولقێنراوە:



لەلایەکی خۆڵە هەڵکەنراوەکەی نێو باخچەی ماڵەکەی، بە پەنجە ناوی کوڕەکەی هەڵکۆڵی. ئینجا تۆی (شبیت)ی خستە ناویانەوە و بە خۆڵ دایپۆشین.

دوای ماوەیەك کوڕەکەی بە ڕاکردن هاتە لای و بە سەرسوڕمانێکی زۆرەوە وتی:

– باوکە! لە سووچێکی باخچەکە بە شبیت ناوی من نووسراوە.

باوکیشی وەك ئەوەی نە بای دیبێ نە باران، وتی:

– ئەوە بەڕێککەوت ڕووی داوە.

بەڵام منداڵەکە ئەوەی ڕەت کردەوە و جەختی لەسەر ئەوە کردەوە کە "بێ هیچ گومانێك یەکێك بەم کارە هەڵساوە"، وتی:

- بابه گیان! شتی وا چۆن دەبیٚ؟ نه ئەو گیایانه ناوی من دەزانن و نه خۆڵەکەش... یەکێك بەم کاره هەستاوه که ناوی من دەزانیٚ...

باوکی بۆی دەرکەوت ئەوەی دەیویست هات بەخەیاڵیدا و وتی:

- باشه، کوڕم! تۆ دەڵێیت که تەنانەت ناوی تۆش ڕێی تێناچێت هەر له خۆیەوه بنووسرێت، ئەی چۆن ئەوەت قبووڵه جەستەی مرۆڤـ که گەلێك لەوه باڵاتر و پڕ هونەرتره بەڕێککەوت دێته بوون؟ کارێکی ئاوا ساده و ساکار هەر لەخۆوه نەبیٚ، ئایا مرۆڤـ و ئاژەڵ و گەردوون که گەلێك لەوه مەزنترن، هەر له خۆیانەوه دێنه بوون؟ ئایا پێویست ناکات هەموو ئەمانەش خولقێنەرێکیان هەبیٚ؟

کوڕی فەیلەسووفەکه به داوای لێبووردنەوه وتی:

- باوکه گیان! زۆر سوپاست دەکەم. بەم نموونەیه بۆم دەرکەوت که ڕێی تێناچێت لەم دونیایەدا سادەترین شت لەخۆوه بێته بوون. بۆ لەمەودوا منیش باوەڕ دێنم بەوەی کردگارێکی مەزن هەیه، که خولقێنەری هەموو شتێکه.

***

- ئایا ئێستا بۆ هەمووتان ڕوون بووەتەوه هیچ شتێك لەم دونیایەدا لەخۆڕه نایاته بوون؟

- بەڵیٚ، مامۆستا! بۆمان ڕوون بووەوه...

– زۆر باشە، کەواتە با لە وانەی داهاتوومانـدا بچینە سـەر باسـی ئەوەی کە ئایا دەگونجیٚ سروشت خولقێنەر بیٚ یان نا، باشە؟

دیسانەوە محەمەدی فەیلەسووف دەیویست قسە بکات...

– بلّیٚ، محەمەد!

– مامۆستا! ئەوەی کە ناشیٚ سروشت خولقێنەر بیٚ هێنـدە ڕوون و ئاشکرایە، ئەگەر دەتانەویٚ هەر ئێستا دەتوانم بۆتانی بسەلمێنم.

– محەمەد! با بۆ وانەی داهـاتوو بیهێڵینـەوە، تـا هـەموران بـیری لێبکەنەوە. هەفتـەی داهـاتوو، لـەو نموونانـە دەدوێـین کـە دەسـتتان دەکەوێت.

# مەیموون لەسەر ئامێری چاپ

کە لە پشوو دەرچوومە دەرەوە، عەلی بە کەمێك سڵەمینەوە هاتە لام:

– مامۆستا! دەمویست شتێك بڵێم، بەڵام... هین...

– قسە بکە، ڕۆڵە!... ئێمە لێرەدا وەك یەك خێزان واین، چ پێویست بە شەرم و سڵەمینەوە دەکات؟!

– مامۆستا! حەزم دەکرد نموونەیەکی تریش لەسەر ئەو بابەتە بێنیتەوە کە لەم وانەیەدا بەدرێژیی باست کرد... بابەتەکەم هەرس کردووە، بەڵام حەز دەکەم کەمێك زیاتر...

– بێگومان کوڕی خۆم، ئەرکی ئێمە باس کردنە و هی ئێوەش پرسین. شتێکی لەمە ئاساییتر نییە... من ئێستا هەوڵ دەدەم بە نموونەیەکی تر ئەوەت بۆ ڕوون بکەمەوە کە ڕێی تێناچێت شتێکی جوان و ڕێك و مانادار بەڕێککەوت بێتە بوون. تۆش دەبێ لە وانەی داهاتوودا ئەو نموونەیە بۆ هاوڕێکانت بگێڕیتەوە. باشە؟

– بەڵێ، مامۆستا!

– دە کەواتە گوێ بگرە. دەپرسین ئایا ئەوە خودایە ئەم گەردوون و زەوی و ئاژەڵ و ڕووەکانەی خولقاندووە یان ڕێککەوت؟

بۆ ئەوەی ئەم جیهانە فراوانەی بوونەوەران زادەی دەستی ڕێککەوت بن، پێویستە ڕێککەوتگەلێکی لە ژمارە نەهاتوو بێنەیەك.

بۆ ئەوەی ئەم گەردوونە، هەر لە گەردیلەوە کە بچووکترین پێکهاتەی ماددەیە، تا دەگاتە گەلەستێرەکان، بەڕێککەوت ببێ، دەبێ ڕێککەوت و لەخۆوە بوونێك کە بە ژمارە لێکنەدرێنەوە هەبێ، ئایا بوونی ئەمە مومکینە؟



● ئایا ڕێی تێدەچێ ئەم مەیموونە بەرهەمێکی مانادار بنووسێ، بگرە دەتوانێ تاکە ڕستەیەکی ڕێکوپێکیش بنووسێت؟
کە تاکە ڕستەیەکیش بەڕێککەوت نەنووسرێت، ئەی چۆن گەردوونێکی مەزن بەڕێککەوت دێتە بوون؟!

– نەخێر، مومکین نییە.

– بێگومان نامومکینە. نەك هەر بەدوای یەکدا هاتن و یەکتر تەواو کردنی ئەم بێشومارەییە، بەڵکو هی چوار پێنجێکیش مومکین نییە. چونکە ڕێککەوت هەست و ژیریی نییە. چۆن هەر لەخۆیانەوە ئاوا بە ڕێکوپێکی بەدوای یەکدا دێن؟ ئایا پێویست ناکات کەسێکی خاوەن

زانین و توانایەکی بێسنوور هەبێ ئـەم جیهـانی بوونـەی خولقانـدبێ و ئەم ڕیزبەندییە جوان و مانـادارەی بـەدوای یەکدا هێنـابێ؟ مـرۆڤ کـە بەتەواوی بیری لەمە کردەوە، ناچارە بڵێ: "بەڵێ، با"

تاقیکرنەوەیەکی لەم جۆرە کراوە لەسەر ئەوەی کە ڕێـی تێناچـێ شتێکی جوان بەڕێککەوت بێتە ئاراوە:

سـەد ئـامێری چـاپ خراوەتـە بـەردەم سـەد مەیموونـەوە، و مەیموونەکان فێر کراون پەنجە بە دوگمەکانەوە بنێن و پێی بنووسن. مەیموونەکان بۆ ماوەی سەد ڕۆژ دوگمەیان داگرتـووە و نووسـیویانە. هـەر یـەکێکیان شـریتی کاغـەزی چـەند مـەتری پـڕ کردووەتـەوە. لـە نووسینەکەی هەموویان کتێبێکی مانادار دەرنەچووە، نەك هـەر ئـەوە بەڵکو وتارێکی مانادار دەرنەچووە، بگرە ڕستەیەکی ڕێك و ڕەوانـیش لەو هەموو نووسینە نەدۆزراوەتەوە.

باشـە بۆچـی لـە ملیۆنـان دوگمـە داگرتنـی گەلـە مـەیموونێك نووسینێکی مانادار دەرناچێ؟

- چونکە بە بێئەقڵی و بێ زانین و تێگەیشتن دەست بـۆ نووسـین دەبەن...

- ئافـەرین، عـەلی! بێگومـان هـەر لەخۆیانـەوە و بەڕێککـەوت دوگمـەکانی ئـامێری چـاپ دادەگـرن... زانایـانی بیرکـاری هەڵسـاون ئەوەیان لێکداوەتەوە داخۆ چـەند ملیـۆن جـار ئـاوا لـە خـۆڕا دوگمـە

دابگرن، دەتوانن ڕستەیەکی مانادار بنووسن. ئەو ئەگەرەی دۆزیویانەتەوە لە هیچ ژمارەیەکدا جێی نەبووەتەوە. ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کە بەڕێککەوت، ڕێی تێناچێ کتێبێکیش بنووسرێ. با لەسەر ئەم خاڵە بوەستین و بیرێکی لێبکەینەوە: مەحاڵە کتێبێکیش بەڕێککەوت بنووسرێ، باشە دەکرێ ئەم گەردوونە بەو ملیۆنان بوونەوەرەی ناویەوە، وا لێك بدەینەوە کە بەڕێککەوت هاتووەتە بوون؟

ئەگەر بێیت و بڵێیت نامیلکەیەکی سادە بەڕێککەوت نانووسرێ، بەڵام لەلایەکی ترەوە بڵێیت ئەم گەردوونە بە خۆر و مانگ و ئەستێرەکانییەوە بەڕێککەوت دروست بووە، ئایا ئەمە لەگەڵ ژیریدا یەك دەگرێتەوە؟

گەردوون چەند لە کتێبێك گەورەترە، ئەگەری بەڕێککەوت دروستبوونیشی ئەوەندە مەحاڵترە. چونکە لەنێویدا ئەوەندە کۆمەڵەی مەزن و بوونەوەری زیندوو و جوانی و هەماهەنگی هەیە کە لەگەڵ کتێبدا بەراورد ناکرێن. ئەگەر سەد مەیموون بۆ ماوەی سەد ڕۆژ کار بکەن، نەتوانن کتێبێکی بچووك و سادە بنووسن، ئەی دەبێ چەند تریلیۆن ساڵ خەریك بن تا بتوانن کتێبی گەردوون بنووسنەوە؟

ئینجا ئایا ئەگەر ئەو هەموو شتە سەراسیمەیەی کە ئەقڵ لێیان تێ ناگات، هەر لە گەردیلە و پرۆتۆپلازم و خانە زیندووەکانەوە تا

دەگاتە هەستی مرۆڤ، بە زادەی ڕێککەوت دابنرێ، نابێ بە گەمژەیی؟ بـە کەسـێکی کاڵفـامی وا کــە بـاوەڕی بەمــە هــەبێت، مەیموونــە قۆشمەکانیش بە پێکەنین دێن.

مـەیموون بـە هـۆی ئـەوەی ئـەقڵی نییـە پێناکـەنێ، بـەڵام خـۆ وا عەلیی ئێمە پێدەکەنێت. وتم:

– عـەلی! ئـەرکێك بـۆ تـۆ.. ئـەم وتـەیـەی سـوقراتی فەیلەسـووفی بەناوبانگ بەجوانی بنووسەوە و لە تابلۆی پۆلدا هەڵیبواسە:

"تەسادوفی تەسادوف (چـاوکەوتن بەڕێککـەوت) لـە گەردوونـدا، مەحاڵە".



● کەسـێك بڵێـت ئـەم تانکـە بەڕێککـەوت دروسـت بـووە و وەسـتایەك نییـە لەپشت دروست کردنییەوە، هەر هیچ نەبێ ـگەمژەی پێدەوترێ. ئەی ئـەوەی دەڵێ: "گەردوون بەڕێککەوت دروست بووە." هەق وایە چیی پێبوترێ؟



## ئایا دەشێ سروشت بەدیهێنەر بێ؟

لە وانەی دواتردا هاتینە سەر باسی سروشت. وتم:

- بۆ ئەوەی لەوە تێبگەین کە ناشێ سروشت بەدیهێنەر بێ، سەرەتا دەبێ لەوەوە دەست پێبکەین کە سروشت چییە؟ بڵێن بزانم...

- ڕوبار و دەریا و بیابانەکان...

- دارستان و ڕووەك و ئاژەڵ...

- خۆر و مانگ و ئاسمان و ئەستێرەکان...

کە ناوی «سروشت» دەهێنرێت، ئەوەی بە خەیاڵماندا دێن، هەر ئەمانەن. پۆلەکەی ئێمەش زۆر بەجوانی پێکای و هەر ئەمانەی وت.

- باشه، دەی با ئێستا بیربکەینەوە... ئایا ئەم بوونەوەرانە کە پێیان دەوترێت: «سروشت»، دەگونجێ بەدیهێنەر بن؟

بەسەرە مۆڵەتی قسەکردنم دایە ئەوانەی بە نیازی قسەکردن دەستیان بەرز کردبووەوە.

| تاکە کتێبێك هەیە کە لە بەردەم هەموو چاوەکاندا کراوەتەوە، ئەویش کتێبی گەردوونە. کە ئەو کتێبە دەخوێنمەوە، باوەڕ بەو خودایە دەهێنم کە هێناویەتییە بوون. هیچ بیانوویێك نییە بۆ نەخوێندنەوەی ئەو کتێبە، چونکە بۆ هەموو کەسێك دەدوێ و زمانێك بەکار دێنێ کە هەموو کەسێك لێی تێدەگات. جان جاك ڕۆسۆ |
| --- |

- بەڵێ، مامۆستا! بێگومان سروشت بەدیهێنەرە. ئەی ئەوە نییە بەردەوام لە کتێب و وانەکانمان و بگرە ڕادیۆ و تەلەفزیۆنەکانیشماندا ئەو ڕستەیە دەبینین و دەبیستین "سروشت بەدیهێنا". ئەگەر سروشت بەدیهێنەر نەبێ، وا دەوترێ و دەنووسرێ؟

محەمەدی فەیلەسووف زۆر قەڵس بووبوو، هەم بەم وەڵامە و هەمیش بەوەی خۆی یەکەم کەس نەبووە قسە بکات...

- محەمەد! بلێ بزانم. بەلام بەو مەرجەی دوو پلە لە ئاستی دەنگت دابگریت!

- ماملاستا! هیچ ڕێی تێناچێ سروشت بەدیهێنەر بێ. ئەمە بیروباوەڕێکی گەلێك هەڵەیە، زانستی نییە. ئینجا لەگەڵ ئەقڵیشماندا یەك ناگرێتەوە، چونکە لە وانەی ڕابردوومانـدا ئـەوەمان بـۆ ڕوون بووەوە کە ڕێککەوتی بێ هەست و زانست و دەسەڵات ناتوانێ بەدیهێنەر بێت. سروشتیش کە هەمان ئەو تایبەتمەندییانەی هەیە، ناتوانێ بەدیبهێنێ. ئەم بوونەوەرانە کە بە هەموویان پێکەوە دەوترێ سروشت، هەر وەك ڕێککەوت، بێئەقڵ و بێزانست و نابینان. هەر بۆیە هیچ ڕێی تێناچێ سروشت بەدیهێنەر بێت.

- ئافەرین، محەمەد! ئەوەت بەتەواوی ڕوون کردەوە کە ناشێ سروشت بەدیهێنەر بێت. ئەوەی کە هاوڕێکەی یەکەمیشتان وتی، هەر ڕاستە. چونکە هەندێ لە کتێب و ڕاگەیاندنەکان، یان بڵێین بەرنامە ڕادیۆیی و تەلەفزیۆنییەکان، ڕستەگەلی وەك "سروشت بەدیهێنا" بەکار دەهێنن. بەڵام ئەم ڕستانە، یان ئەوەتا بێئەوەی بیریان لێکرابێتەوە دەوترێن، یانیش دەستەواژەگەلێکی بێباوەڕانەن، چونکە تێگەیشتن لەوەی کە ئەم سروشتەی لەبەر چاومان ڕاخراوە بەدیهێنەر نییە بەڵکو بەدیهێنراوە، هەر زۆر ئاسانە، هەر ئەوەندەیە کە دەبێت کەمێك وردتر بیر لە مەسەلەکە بکرێتەوە.

- ئێستا هەمووتان پاڵ بدەنەوە و قیت دابنیشن و سەرنجە تیژەکانتان بخەنە سەر قسەکانی من.

## سروشتگەرایی بیروباوەڕێکی سەرەتاییە

- ڕۆڵەکانم! سروشتگەرایی بیروباوەڕێک نییە تازە هێنرابێتە ئاراوە. لە چاخە سەرەتاییەکانیشدا کەسانێک هەبوونە وتوویانە سروشت بەدیهێنەرە، کەسانێك هەبوونە خۆریان پەرستووە، هی وا هەبووە مانگ و ئەستێرەی پەرستووە... تەنانەت تا ئەم دواییانەش هی وا هەبووە جۆرە درەختێکی پەرستووە. جاری وا هەبووە ئاژەڵ پەرستراوە. ئەوە نییە لە ڕۆژگاری ئەمڕۆشماندا هیندۆسەکان لە هیندستان مانگا بە پیرۆز دەزانن و دەیپەرستن؟ ئێستا لەوێ، جاری وا هەیە مانگایەك دێ و لە قەرەباڵغترین شەقامدا لێی پاڵدەکەوێ و هاتوچۆ پەك دەخات، هەموو ئۆتۆمبێلەکان دەوەستن و دەکەونە چاوەڕێ کردن. ئەوەی هۆڕنیش لێبدات، بە تۆمەتی ئازار دانی مانگای پیرۆز بەتوندی سزا دەدرێت...

***

لە کۆندا ئەم پەرستنەی بەشێك لە سروشت و بە خودا زانینەی، چۆن دەستی پێکردووە؟ ئێستا با بێینە سەر ئەمە:

کاتێك مرۆڤەکان لە ڕێبازی ئەو پێغەمبەرانەیان لاداوە کە خودایان پێناساندوون، دواتریش لە ژێر کاریگەریی نەفامیدا، بوونە بە سروشتگەرا. کەواتە سروشتگەرایی بیروباوەڕێکی گەلێك سەرەتاییە. پەیدا بوونیشی بە هۆی لەبیرچوونەوەی باوەڕی ڕاست و دروستەوەیە. بەڵام ئەو سروشتگەراییە سەرەتاییە گەلێك لەم



سروشتگەراییەی ئەمڕۆ مەنتیقیترە، چونکە هەر هیچ نەبێ ئەوە دەردەبڕێ کە کام بەشەی سروشت بە بەدیهێنەر دادەنێ. بە هۆی نەزانییەوە، یان ئەوەتا ئەو گەواڵە و برووسکەیەی هەڵیدەبزرکێنێ دەپەرستێ، یانیش ئەو خۆرەی بەردەوام بە گەشاوەیی دەیبینێ و ناتوانێ بیگاتێ... یان ڕووبارێك کە خێری لێدەبینێ و دەیەوێ لە زیانی بەدوور بێ، یان ئەستێرەگەلی بێشومار... هەندێك جاریش ئەو ئاگرەی گڕ لە هەموو شتێك بەردەدا و دەیکا بە خۆڵەمێش، یان ئەو

مانگایەی سوودی زۆری هەیە بۆی... سەرەنجام دەتوانین بڵێین: ئەو خەڵکەی سەردەمانی کۆن، کە باوەڕی لەدەست داوە و لێی دوور کەوتووەتەوە، یان لە ترسا یانیش لە خۆشەویستیا شتێکی ئەم سروشتەی بە خودا زانیوە و پەرستوویەتی. بەلام سروشتگەرایانی ئەمڕۆ ئەوە دەر ناخەن کە کام بەشەی سروشت بە بەدیهێنەر دادەنێن، هەر ئەوەیە دەڵێن: "سروشت بەدیهێنا...".

ئەم قسەیە هەر بۆ خۆ دزینەوەیە، چونکە خۆ سروشت لە تاکە بەشێك پێك نەهاتووە... کام بەشەی خولقێنەرە؟

– مامۆستا! ئایا مەبەستیان ئەوەیە سەرجەمی سروشت بەدیهێنەرە؟

– تۆ بڵێی وا بێ؟! ئێستا با یەکە بە یەکەی ئەم بۆچوونانەیان وەربگرین و لەسەریان بوەستین.

– مامۆستا! پێم وایە ئەمانە بۆچوون نین بۆنەچوونن!

– ڕاستە، محەمەد! بەلام لەبری ئەوەی بە یەکجاری وەلای بنێین، وا چاکترە بە شێوەیەکی زانستی وەریبگرین و لێی بدوێین. پێویستە مێشك و دڵمان ئیقناع بن. ئەگەر وا بکەین، ئەوە باوەڕمان بەهێز دەبێ و پەیڤی "سروشت بەدیهێنا" نایلەرزێنێ.

بەگشتی سەرەتا با لە سروشت بڕوانین. سروشت بەرهەمە، وەك هەر بەرهەمێك سەرەتایەکی هەیە. بەو مانایەی کە زانستی ئەمڕۆ

خەبەری ئەوەمان دەداتێ سەردەمانێك بوونی نەبووە و وەك ئێستای نەبووە. مانای وایە دواتر خولقێنراوە. هەر شتێك لە سەرەتادا نەبووبێ و دواتر هاتبێتە بوون، ئەوا بەدیهێنراوە. ئەی بەدیهێنەر کێیە؟

ئایا دەتوانین بڵێین سروشتە؟ ئەو کات دەبێ بڵێین سروشت هەر لەخۆوە هاتووەتە بوون. لە وانەکانی ڕابوردووشماندا ئەوەمان بۆ ڕوون بووەوە کە ئەمە مەحاڵە. کەواتە ڕێی تێناچێ سروشت خۆی خۆی بەدیهێنابێ. کەواتە چەند هۆکارێك هاتوونەتە یەك و ئەویان هێناوەتە بوون و خولقاندوویانە؟ ئەوەشمان سەلماند کە هۆکارەکان ناتوانن خولقێنەر بن. کەواتە کێ خولقێنەری سروشتە؟

– خودا...

– بێگومان خودا... چونکە ئەوەی ئەم سروشتەی بەو جوانی و ڕێکوپێکییە سەرنج ڕاکێشە دروست کردووە، دەبێ هەم خاوەنی زانستێکی بێ کۆتا بێ و هەمیش بتوانێ ئەوەی دەیزانێ بیخاتە گەڕ. کەس هەیە وا بێ، لە خودا زیاتر؟

سەیرکەن ڕۆڵەکانم! بیرکردنەوە لە سروشت وەك بەدیهێنەر، چ هەڵەیەکی مەنتیقییە؟! چونکە ئەوکاتە بە «بەدیهێنراو»ێك وتراوە «بەدیهێنەر»...

سروشت ئەقڵی هەبوایە، ئەویش بەم کارە نامەنتیقییە تووڕە دەبوو و دەڕەنجا. گەر حەز دەکەن با بە نموونەیەك ئەمەتان بۆ ڕوون بکەمەوە:

## سروشت هونەرە، نابێ بە هونەرمەند

– کێ لاوازترین قوتابیی ئەم پۆلەیە؟ وا بزانم (ئایدن)ە، وا نییە؟

– بەڵێ، مامۆستا! بەڵام باوەڕەکەی زۆر بەهێزە.

– محەمەد! واز لە فەلسەفە بێنە و گوێت لە من بێ... دەبینن وا ئایدن لەسەر بوونەوەرێکی گەورەی دێو ئاسا دێت و دەچێت. با بڵێین ئەم بوونەوەرە مەزنە پیاوێکی کەڵەگەتە... پاڵی داوەتەوە و لەسەر پشت لێی خەوتووە... ئایدن هەر بەوە ناوەستێ کە بەسەریدا دێت و دەچێت، بەڵکو دار دەکێشێ بە لووتیا، قژی ڕادەکێشێ، چاوی دەردێنێ، سکی کون دەکات... بەڵام سەرەڕای هەموو ئەمانە، کابرای چوارشانەی خەو لێکەوتوو، هیچ کاردانەوەیەکی نییە و فزەی لێوە نایات.

ئایدن بەسەریدا دێت و دەچێت، دەدڕێ و دەبڕێ... بە بینینی ئەم دیمەنە بیرتان بۆ چی دەچێت؟ ئایا دەتوانن ئەو ئەگەرە دابنێن کە ئەم پیاوە ساغ و زیندووە؟



– نەخێر، مامۆستا! ناشێ ساغ بێت. ئەگەر زیندوو بێ و دەسەڵاتی هەبێ، بەو گەورەییەیەوە بەدەست ئایدنەوە دەبێ بە لەیستۆك.

– بێگومان، نا... کەواتە ئەم کابرایە ساغ نییە، زیندوو نییە، خولقێنەر هەر هیچ!

بەڵێ، سروشتیش هەر وەك بوونەوەرە مەزنەکەی نێو ئەم نموونەیە وایە. بەسەر ئەو داماوەدا دێین و دەچین و چیمان بوێت لەسەری دەیکەین. بۆ نموونە بیر هەڵدەکەنین و نەوت و ئاوی لێدەردەهێنین. تونێلی بەناودا لێدەدەین و ڕێگەی بەناودا ڕادەکێشین. دارستانەکانی دەبڕینەوە و پێشی ئاوەکانی سەر ڕووی دەگرین تا بەنداو دروست بکەین. بەڵێ هەموو ئەمانە دەکەین، ئینجا دێین و بەو سروشتەی وەك لەیستۆك یاریی پێدەکەین دەڵێین:

– خەم مەخۆ! ئێمە وا و وا لە تۆ دەکەین، بەڵام لە ڕاستیدا تۆ بەدیهێنەریت، بەدیهێنەرێکی مەزن... بەدیهێنەری هەموو شتێکیت...

ئەگەر سروشت بابیی ئەوەندە ئەقڵی هەبووایە لەوە بگەیشتایە کە پێی دەوترێت بەدیهێنەر، زۆر قەڵس دەبوو. ئێ خۆ ئەمە هی تووڕە نەبوون نییە، وا نییە؟... بیخەرە ژێر پێت و بەسەریدا پیاسە بکە، هەر بەمەش مەوەستە، چیت دەوێت پێی بکە، ببڕە، بڕوێنە و یاریی پێبکە... ئینجا هەڵسە و پێی بڵێ "ئەی سروشت! تۆ ئێمە و هەموو شتێکت بەدی هێناوە"... سروشت لەمە بگەیشتایە، هەر بە تووڕە بوون نەدەوەستا، بەڵکو ئەو جۆرە کەسانەی سزاش دەدا...

***

ئینجا با بیرێك لەوەش بکەینەوە... ئێوە شتێك خۆتان نەتانبێ، دەتوانن بیدەن بە کەسانی تر؟ دەتوانن شتێك کە خۆتان نیتانە بڵێن وەڵڵا دەیدەینە فلان؟

یەکێك بانگەشەیەکی وا بکات، مانای وایە مێشکی خەلەلی هەیە. ئێستا با بیربکەینەوە، سروشت کە خۆی ئەقڵ و بیر و چاو و گوێ و جووڵەی نییە، دەتوانێ بیدا بە کەسانی تر؟

– نەخێر، ناتوانێ.

– کە ناتوانێ بیدا، مانای وایە ئەو بوونەوەرە ژیر و زیندوو و بزواوەکانی بەدینەهێناوە.

– سروشت توانای بەدیهێنانێکی وای هەبوایە، یەکەم جار خۆی لە ژێر پێمان دەردەهێنا و خۆی دەکرد بە بوونەوەرێکی سەنگینتر. بوونەوەرێك لە ژێر پێدا بێت، دەشێ خولقێنەر بێت؟ خۆ ئەگەر بشبێ، ئایا دەتوانێت بوونەوەرێکی لە خۆی بالاتر و زیندووتر و بەنرختر و ژیرتر بەدیبهێنێ؟ بەو مانایەی ئایا دەتوانێ بالاییەك لە خۆیدا نەبێت، بیدات بە هی تر؟

بێگومان ناتوانێ، ئەی وا نییە؟ کەواتە "سروشت بەدیهێنا" وتەیەکە لە ئەسڵدا هیچ بیری لێنەکراوەتەوە. چونکە سروشت هونەرە، هەموو هونەرێکیش هونەرمەندێکی هەیە. سروشت نەقشە، نابێ بە نەققاش. کۆمەڵە یاسایەکە، نابێ بە یاسادانەر. بەدیهێنراوە، نابێ بە بەدیهێنەر.

کەواتە کە جیهانی بوون، لەلایەن هۆکارەکانەوە نەخولقێنرابن، بەرێککەوت نەهاتبنە بوون، زادەی دەستی سروشتیش نەبن، ئەی کێ خولقێنەریانە؟

– خودا...

– بەڵێ، خۆشەویستەکانم! ئەوەی دەمێنێتەوە هەر ئەم ڕاستییەیە. کەواتە مرۆڤێك بیربکاتەوە، ناچارە باوەڕ بە خودا بهێنێت.

باوەڕ بە خودا ئەو ئاڕاستەیەیە کە ئەقڵ مەجبووریەتی.

# پێڕست

پێشەکی ........................................ ٣
پێشەکی وەرگێڕ........................................ ٥
مردن نەبوایە ........................................ ٩
شەیتان بۆچی بەدی هێنراوە؟ ١٤
ئایا باران زیانبەخشە؟........................................ ١٦
ئەگەر بە چەقۆ تاوان ئەنجام بدرێت........................................ ١٧
ئاگر نەبوایە........................................ ١٩
بەدیهێنانی شەیتان، کارێکی نابەجێ نییە ١٩
شەیتان وەك لاستیکی بۆکسێنە ........................................ ٢٢
سەربازە گیان لەسەر دەستەکانی شەیتان........................................ ٢٤
کۆسپی شەیتان لە تاقیکردنەوەی دونیادا ٢٩
گەورەترین تەڵەی شەیتان ........................................ ٣١
(ئەسڵی)ـیەکان دەگەڕێنەوە سەر ئەسڵیان ........................................ ٣٤
ئەو پیاوەی پاپۆڕەکەی (قازی کۆی) بەجێی هێشت ........................................ ٤٠
نامەکەی (ئەسەنگوڵ) ........................................ ٤٧
شارستانێتی و پەنجە گەورە ........................................ ٥٣
ئایا لەسەرمانە سوپاسی پەنجە گەورە بکەین؟........................................ ٥٤
بوون بە چاکترین........................................ ٥٩
مۆدیلێکی نەگۆڕ........................................ ٦٢

پتەو کردنی باوەڕ ........................ ٦٦
بەر لە هەر شتێك باوەڕ ........................ ٦٩
باوەڕ خۆراکی گیانە ........................ ٧٦
مەرجی بوون بە موسوڵمان ........................ ٧٩
لالە حەسەن و دراوسێ ئەرمەنییەکەی ........................ ٨٢
لالە حەسەن چاکی کرد یان خراپ؟ ........................ ٨٤
ڕێگەی موسوڵمان بوون ........................ ٩٠
سەرەنجامی نەفامی ........................ ٩٥
هەر زانین بەس نییە، هێنانەجێ گەرەکە ٩٧
فێزەی بەهەشت ........................ ١٠٠
مرۆڤی کامڵ ئەوەیە کە باوەڕدارە ........................ ١٠٦
سێ بانگەشەی نکوڵیکاران ........................ ١١٣
ئایا ڕێی تێدەچێ هۆکارەکان خولقێنەر بن؟ ........................ ١١٧
ئایا هۆکارەکان سێو دەخولقێنن؟ ........................ ١٢١
داو و دەرمانەکان چۆن دروست دەکرێن؟ ........................ ١٢٧
ڕێککەوت یان لەخۆوە بوون ........................ ١٣١
بێ ئەوەی یەکێك دروستی بکات، پردێك لەخۆیەوە دروست دەبێ؟ ... ١٤٠
بۆ ناتوانین خودا ببینین؟ ........................ ١٤٦
ئایا دەکرێ هەر شتێکمان نەبینی باوەڕی پێنەکەین؟ ........................ ١٥١
ئایا بەڕێککەوتە؟ ........................ ١٥٨

ڤیتامینەکان ڕێ هەڵە ناکەن .................................. ١٦٦
ئایا شتێکی نارێك و بێ بنەما لە گەردووندا هەیە؟ .................. ١٦٩
کولەکە لە جێی گوێز بووایە.......................................... ١٧٣
ئەو ناوەی گیاکان نووسییان.......................................... ١٧٦
مەیموون لەسەر ئامێری چاپ ......................................... ١٧٩
ئایا دەشێ سروشت بەدیهێنەر بێ؟ ................................. ١٨٤
سروشتگەرایی بیروباوەڕێکی سەرەتاییە .............................. ١٨٧
سروشت هونەرە، نابێ بە هونەرمەند ................................ ١٩١